# سەرنجێك لە چەند زاراوەیەكی تازە بەكـار هاتوو و كۆڕی زانیـاری كورد

دوكتۆر جەمال نەبەز

بەرلین : تیشرینی دووەمی ١٩٧٧

## سەرەتایەكی پێویست

بەر لەوەی بچمە نێو جەرگەی باسەكەوە ، دەمەوێ خێرا ئـەوە بلێم كە سەری باسەكەم بە تایبەتی بەو جۆرە هەلبژاردووە ، واتـە نەمویستووە بلێم « كۆڕی زانیاری دەبێ چۆن بێ و چۆن نـەبێ » : ئەمەش لەبەر ئەوەیە كە باسەكە لە باری سەرنجی خۆمەوە دەنووسم و ناشمەوێ خۆم بكەم بە دەمڕاستی هیچ كەسێك ، چونكە ڕەنگە هی وا هەبن كۆڕیان بەجۆرێكی دی بوێ . ئەمجا با ئەوانیش بێنەڤـە و بیروڕای خۆیان لەم بارەیەوە دەربڕن و ڕاستیش تەنیـا لـە بـە یەكدادانی چەند بیروڕایەكی جیاوازەوە دەردەكەوێ .

جارێ با لەوە بگەڕێین كە ئایە ئەم نێوە « كوڕی زانیاری كورد » نێوێكە پڕ بە پڕی « المجمع العلمی الكردی »یە یان نا ، چونكە لەكـاتی خۆیدا و هەر لە گۆڤـاری كۆڕ خۆی‌دا لەم باسـە دراوم و دووپاتكردنەوەشی بە پێویسـت نازانم(١) بـەلام بـا جـاری چـاو لـە نێوەكـە بپۆشین و بچینـە سەر نێوەرۆكی كۆڕ و بزانین ئایـە ئـەم « كۆڕی زانیاری »بـە پێویستی‌یەكانی سەر شانی خۆی وەك كۆڕێكی زانستانە بەجـێ

هێناوه و ئەو دەورەی کە لێی چاوەڕوان دەکرا بیگێڕێ گێڕاویتی یان نا ؟

کۆڕێکی ئەکادیمی ، لە هەر وولاتێکدا بێ ، داوودەزگایەکی زانستانەی ڕێزلێگیراوی ، باوەڕ پێکراوی ، قسەڕۆیوە . ئەم جۆرە کۆڕانە هەر یەکەیان ڕێکخراوێکی دەوڵەتی یە و لە لایەن حکوومەتی ئەو وولاتەوە سەربەرشتی دەکرێ و مەرجەکانی کارکردن و ژیان ، بۆ خۆی و هاوکارەکانی دەست نیشان مۆگەر دەکرێ و بڕیارەکانیشی هێزی قانوونیان هەیە و هەموو دەزگا زانستی یەکانی وولات ناچارن ئەو بڕیارانە بگرنە گوێ و لەسەری بڕۆن و لێی لانەدەن . ئەمەش وەنەبێ شتێك بێ و بە زۆر بسەپێنرێ بەسەر خەلکیدا . نەخێر . خەلکەکە خۆی لە خۆیەوە سەر بۆ بڕیارەکانیان شۆڕ دەکا ، چونکە لێوەشاوەترین و بە ناوبانگترین زاناکانی ئەو گەلە لەو کۆڕانەدا کار دەکەن و هەر ئەو کۆڕانەشن کە نەخشەی کاری زانستانە بۆ پاشەڕۆژ دەکێشن .

بزووتنەوەی ڕۆشنبیرانەی نەتەوەیی یانە ( الحركة الثقافية القومية ) لە نێو کورددا مێژوویەکی کۆنی نی یە . هەمووی پەنجا شەست سالێکە کە زمانی کوردی بۆ نووسین و کاروباری گشتی کەوتووەتە نێوانەوە . بە داخەوە زرووفی سیاسی ی ڕۆژهەلاتی نێوەڕاست پاش جەنگی جیهانی ی یەکەم هەلێکی وای بۆ نەتەوەی کورد هەڵنەخست کە بکارێ ( بتوانێ ) زمانەکەی خۆی بە شێوەیێکی ڕەسمی بەکار بهێنێ و ئەوە بوو لە هەموو کوردستاندا تەنیا کوردەکانی عێراق و یەکێتی ی سۆڤێت بوون کە توانیان بە زمانی خۆیان بکەونە نووسین و پەرەی پێ بدەن و لێیان نەبجڕێتەوە(٢) . جا لەبەر ئەوەی هێزێکی مادی یا گیانی لە پشت ئەم تۆزە هەلەوە نەبوو تا پالی پێوەبنێ ، ئەوا هیچ سوودێکی ئەوتۆی لێ نەبینرا و نەتوانرا خزمەتی زمانی کوردی لە سنوورێکی فراواندا و لە سەر بنچینەیەکی زانستانە بکرێ . چونکە ئەوەی ڕاستی بێ ، خزمەتی ڕاستەقینەی زمان تەنیا لە ڕێی ئەو کۆڕانەوە دەکرێ کە باسمان کرد ، ئەوەش بە مەرجێ بەو شێوەیەی سەرەوە دامەزرابن . ئەگەنا خزمەتی تاکە تاکەی خەلك هەر چەندە بە نرخ و بەسوودیش

بێ ، هێشتا ناگاته پلەی خزمەتێکی بە کۆمەڵ کە دەستێکی بـــە دەسەڵات پشتی گرتبێ ، ئەوەشـــ تا ئەم دواییە بۆ کـــورد هەڵنەکەوت .

ئاشکرایە کە سەختترین کۆسپ لە ڕێی زمـــانی کـوردیدا نەبوونی ئەلفوبێیەکی یەکگرتوو و زمانێکـــی ئەدەبیی یەکگرتووە . هەرچی ئەلفوبێکەیە ، ئەوا دەزانین کە لە پێشدا زمانی کوردی بـــە ئەلفوبێیەکی لە عەرەبی و فارسییـــەوە خواستراو دەنووســـرا و ئەوەش بە لاسایی کردنەوەی کوتومتی ئۆرفۆگرافیای ئەو دوو زمانە. هەتا ئەوە بوو لە عێراق ئەم ئەلفوبێیە بەرە بەرە دەستکاری کـــراو وای لێ کرا کە پتر لە جاران بەبەر زمانی کوردی بکـــات و دوای ئەوەش کوردەکانی ئێران لە سەر ڕێ و شوێنی کوردەکانی عێـــراق ڕۆیشتن . بەڵام کوردەکانی سووریە و سۆڤێت بە تیپی لاتینـــی دەستیان کرد بە نووسینی . جا ئەگەر چی لە سووریە هەر لە ســەر ئەو ئەلفوبێیە ڕۆیشتن ، بەڵام ئەوە بوو لە سۆڤێت ئەو ئەلفوبـــێ لاتینییە گۆڕرا بە ئەلفوبێی سریالی و کوردەکانی تورکیاش تا ئـــەو ئەندازەیەی ڕێیان بووە بە کوردی بنووسن ، ئەلفوبێی لاتینییـــان بەکار بردووە . بە کورتی مەسەلەی یەکخستنی ئەلفوبێی کـــوردی هەر وەك خۆی مایەوە و ئێستە سێ جۆرە ئەلفوبێ بۆ زمـــانی کوردی بەکار دەهێنرێ کە هیچیان ڕێ و شوێنی تەواوی سنوور دیـاری بۆ دانەنراوە(٣) .

هەرچی مەسەلەی زمانە یەکگرتووە ئەدەبییەکەشە ئەوا دەبـــێ بزانین کە هەر چەندە ئەم ناتەواوییە وەك کەلێنێك لە ســــەدەی ڕابوردووەوە هەستی پێ کراوە(٤) ، بەڵام هەتا ئێستە بایەخێکـــی زانستانە بە دروستکردنی نەدراوە . لە ساڵی ١٩٣٤دا کۆنگرەیەکـی کوردناسەکانی یەکێتیی سۆڤێت بڕیاری دا شێوەی کرمـــانجیی ژووروو بکاتە شێوەی ڕەسمی بۆ هەموو کورد(٥) . ئەوەش بوو لـــە ئەیلوولی ساڵی ١٩٥٩دا کۆنگرەی مامۆستایانی کوردی عێراق لـــە شەقڵاوە بڕیاری دا ئەو شێوەیەی کە بە « سۆرانی » ناسراوە بکا بـە شێوەی ڕەسمی و بنچینەی زمانی یەکگرتووی کوردیی دواڕۆژ(٦) . بێ گومان ئەم شتانە هەمووی بڕیاری سەر کاغەز بوون و بـە کردەوە

هبجیان لەدوا نەبوو[٧] . چونکە ڕاستی‌یەکەی دەستبردن بۆ کارێکی وا زاتێکی گەورە و وەستایی‌یەکی زمانەوانی‌ی قووڵ و دەسەڵاتێکی جێ بەجێ کەرانەی فراوانی دەوێ . لەبەر ئەوە ئەم قسانە هەموو قسەی لاتەنیشت بوون و کارە بنچینەیی‌یەکە کە ئەوە بوو لە پێشدا کۆڕێکی زمانەوانی زانستانە بێ تا ئەم هەنگاوە بنێ ، باسی لێ نەکرا و بە کوڵ و دڵ هەوڵی بۆ نەدرا . بە کورتی ئەگەر ویستت فیلم دەربکەیت و ببیتە خاوەنی سینەمای خۆت ، ئەوا دەبێ بەر لە هەموو شتێك تیپێکی شانۆت هەبێ . کە زمانی یەکگرتووشت ویست ، ئەوا دەبێ کۆڕێکی زمانەوانی‌ی زانستانەت لە پێشدا هەبێ . ئەگەر ئەوەت نەبوو ، هەر قسەیەك لەم مەیدانەدا بکەیت ، ئەوا بە فیڕۆ دەڕوات .

ئەز بەش بەحاڵی خۆم لە سەرەتای ساڵەکانی پەنجاوە هەستم بەوە کردووە کە زمانی کوردی نە ئەلفوبێ‌یەکی ڕێکوپێکی دەبێ و نە شێوەیەکی ئەدەبی یەکگرتووی دەبێ و نە دەشبێتە زمانی کیمیا و فیزیك و ماتماتیك و فەلسەفە و بژیشکی ( الطب ) تا لە ڕێی کۆڕێکی زمانەوانی‌ی بەدەسەڵاتەوە خزمەت نەکرێ . بۆ ئەمەش هەر لەو کاتەوە هەوڵم داوە کە لە سنووری توانستی خۆمدا هەنگاوێك بەرەو دروستکردنی کۆڕێکی زمانەوانی بنێم . لەبەر ئەوە هەوڵم دا چەند برادەرێکی ئەو دەمەی خۆم کە هەموومان لە بەشە زانستی‌یەکانی زانستگەی بەغدادا دەمانخوێند ، وا لێ بکەم بۆ ئەم مەبەستە هاوکاریم بکەن . بە کورتی لە هاوینی ساڵی ١٩٥٢ەوە تا هاوینی ١٩٥٣ کۆمەڵێکی چەند کەسیمان بۆ وەرگێڕان و داڕشتنی زاراوەکانی ماتماتیك و فیزیك و کیمیا دامەزراند ، کە بە زۆری لە پشووی هاوینی ئەو دوو ساڵەدا لە باخی بەرتەکیی سلەیمانی کە باخی فەرەجی حەمە مرادیان پێ دەگوت ، کۆ دەبووینەوە . جا لەبەر ئەوەی ئەو دەمە زمانی کوردی زمانی نان پەیدا کردن نەبوو ، ئێمەش چەند گەنجێکی نەناسراو بووین و هیچمان تەمەنی لە ( ٢٠ ) ساڵ تێپەڕی نەدەکرد ، کارەکەشمان وەك هەموو هەنگاوێکی پێشڕەوانەی دی نەدەچووە مێشکی هەموو کەسێکەوە ، لە بەر ئەوە زۆر بەربەرەکانێ کراین . هێندێ کەس بە شێتیان دادەناین و دەیانگوت ئەمانە تێکچوون بۆیە ئەمە دەکەن و بەزەیی‌یان دەهاتەوە پیاماندا .

هێندێکی دی دەیانگوت نە ئەمانە ئیستیعمار ڕای‌سپاردوون ئەمە بکەن ، وەك ئیستیعمار هیچ ئیشوکاری نەبێ هەر خەریکی ئەوە بێ زاراوەی زانستانە بۆ کورد دروست بکات . هەندێکی دیش دەیانگوت نە بابە ئەمانە چەند منالێکی خوێن گەرم و کەرن ، ئەگەنا کێ ئەم شتانە دەخوێنێتەوە و بەکاریان دەهێنێ . ئەوا با بلێین ئەمەشیان کرد و چاپیشیان کرد ، کێ گوێی دەداتێ و کێ دەیکڕێ . بێ گومان ئەم قسەیە لە باری سەرنجی ئەوانەوە کە بازرگانانە دەڕوانە هەموو کارێك زۆر ڕاست بوو . ئەو دەمە زمانی کوردی بازاڕی نەبوو . ئەوی خزمەتی زمانی کوردی دەکرد نەك هەر تەنیا نانی پێ دەست نەدەکەوت ، بەلکو ئەگەر نانیشی ببوایە ، نانی دەبڕا . لەگەل ئەمەشدا هی وا هەبوو کارەکەی ئیمەی زۆر بە دڵ بوو و لە سەری دەکردینەوە . بە کورتی کۆمەلەکە لە سالێك پتر نەژیا و کارێکی ئەوتۆی بەرهەم نەهێنا . بەلام ئەز هەر دەستم هەلنەگرت و هەولم دا لە سنووری توانستدا زمانی کوردی بکەمە زمانێکی زانستانە و گەلێك کارم بۆ بلاو کردنەوە گەلالە کرد لە کاتی خوێندندا لە زانستگەی بەغدا و کە لە سالی ١٩٥٥دا بومە مامۆستای فیزیك و ماتماتیك لە توتابخانە ناوەندیەکانی کەرکوك دەستم کرد بە نووسینەوەی چەند بەرگێك کتێبی زانستانە بە کوردی یەکێك لەوانە « سەرەتای میکانیك و خۆمالەکانی مادە »یە و ئەوی دیان « سەرەتای جەبرە »ە . هەر دووکیانم لە سالی ١٩٥٧دا لە کەرکوك تەواو کردووە[٨] . بۆ هەر یەکێك لەم بەرهەمانە فەرهەنگۆکێکی زانستیم دروست کردووە بە کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی . کە لە هاوینی ١٩٥٦دا چووم بۆ شام ، چاوم بە چەند نووسەر و ئەدیبێکی کوردی‌ئەوێ ی وەك عوسمان سەبری و قەدری جان و ڕەوشەن بەدرخان کەوت و مەسەلەی دامەزراندنی « ئەکادیمی زانستانەی کورد »م باس کرد لە گەلیان[٩] . هەر لە سالی ١٩٥٧دا و بە بۆنەی بلاوکردنەوەی نامیلکەی « خوێندەواری بە زمانی کوردی »یەوە دیسانەوە باسی پێویستی دامەزراندنی « دەستەی نووسەرانی کورد » و « کۆڕی زانیاری زمانەوانی »م کردەوە[١٠] و لە سالی ١٩٦٠دا نامیلکەی « هەندێ زاراوەی زانستی »م لە سلەیمانی و لە ١٩٦٠–١٩٦١دا « فەرهەنگۆکی زانستی »م لە هەولێر بلاو کردەوە و کە لە سالی ١٩٦٠دا بومە مامۆستا لە

قوتابخانەی نێوەندی‌ی هەولێر بە یارمەتی هاوڕێ‌ی خۆشەویستم مامۆستا عەبدولحەمید ئیسماعیل لیژنەیەکمان بۆ ئەم مەبەستە دروست کرد .

ئەمانەی لە سەرەوە باسم کردن چەند لاپەڕەیەکن لە مێژووی هەولدان بۆ دامەزراندنی « کۆڕێکی زانستانەی زمانەوانی » و ئەو ڕاستی‌یەشی دەردەخەن کە ئەو کۆڕەی بە نێوی « کۆڕی زانیاری کورد »ەوە لە ۱۹٦۹دا لە عێراق دامەزرا ، ئاواتی چەند ساڵەی من بوو هاتە دی ، کە هەواڵی هاتنە بوونی لەم دوور وولاتەوە ئۆخەیی‌ی لە گیان و دەروونم خست . بەڵام داخی بەجەرگم کۆڕ هەر لە سەرەتاوە وەك زارۆیەکی لە بار چوو هاتە جیهانی کوردەواری‌یەوە و لە سەر بنچینەیەکی پتەو دانەڕێژرا . باری سیاسی کوردستان بە تایبەتی لە ساڵانی ۱۹۷۰ تا ۱۹۷٤ بە جۆرێك ئاڵۆزکاو بوو کە باو بوو بە باوی فشە کوردایەتی و پیاوی هەلمەتەکاسە و ماستاو ساردکەرەوەش قسەی سواربوو . لە بەر ئەوە زۆربەی زۆری ئەو دەزگا خوێندەواری و ڕۆناکبیری‌یانەی بە ئەرك و فیداکارێتی‌یەکی بێ ئەندازەی ڕۆڵە بە غیرەتەکانی گەل هاتنە کایەوە ، کران بە دیاری و پێشکەش بەوانە کران کە بە درێژایی‌ی ساڵانە لە تەڕ خواردیان و لە ووشك نوستن و هەموو سەرمایەیەکیان خۆ هەڵبەساردن بوو بە چەند سەرکردەیەکی عەشائیری‌ی نەزان و تەنگ‌بینەوە . بەشێکی زۆری ئەوانەی لێ‌هاتوو و دڵسۆز و بەکار و لێ‌زان بوون خرانە پشت گوێ و تووڕ هەڵدرانە دوور و ئەو کۆڕە زانیاری‌یەی کە دەبوو ببێتە مولکی گەل ، بوو بە مولکی چەند کەسێك کە هێندێکیان تەنانەت سەرە واوێکیشیان لە ووردگدا نەبوو . جا تەزووی ئەو بێ‌دادی‌یە هەتا ئەمڕۆش هەر ماوە و هەر لەبەر ئەوەشە ئەو پارە زۆرە[11] و ئەو چاپخانە نایابە و ئەو کتێبخانە بێ وێنەیەی کوڕ لە بەر دەستیایەتی و ئەو هەموو فەرمانبەر و کار بەدەستە زۆرەی کۆڕ هەیەتی ، سوودێکی ئەوتۆیان لێ نابینرێ .

ئەز کە ئەم قسانە دەکەم و ڕەخنە لە کۆڕ دەگرم ، هەر لە پێشەوە دەڵێم مەبەستم لەمە شکاندنی کۆڕی زانیاری نی‌یە ؛ چونکە ئەوەتە ئاواتی ۲٥ ساڵ لەمەوبەری خۆمە و بە کردەوە ڕەنجم بۆ

کێشاوە . هەر کەسێك پچێك ویژدانی بێ دان بەو ڕاستی دا دەنێ . ئامانجیشم ئەوە نی‌یە کە کۆڕ لە ترساندا « زلم بکات » . ئەگەر ئەو جۆرە « زلێتی »یانەم بویستایە دەمێك بوو هەمبوو . هەروەها بە هیچ جۆرێك لەگەڵ ئەوانەشدا یەك ناگرمەوە کە قسە بە کۆڕ دەڵێن چونکە خۆیانی « زل » نەکردووە ، وەك چۆن کۆن لەگەڵ ئەوانەدا نەبووم کە هێرشیان دەبردە سەر کۆڕ و پاش ماوەیەك قوڕوقەپیان لێ کرد ، دوای ئەمە کارێکی پچووکیان پێ سپێردرا . ئەم ڕەخنانەی ئاراستەی کۆڕیان دەکەم لەوەوە دێ کە جگەرم بۆ حاڵی زمان و کولتووری گەلەکەمان ژان دەکا و دەربەستیش نایەم ئەگەر بێتو دڵی دنیایەك خەڵك لە سەر هەق لە خۆم بیەشێنم . جا وا لێرەدا هێندی لە ناتەواوی‌یەکانی کۆڕ بە ڕیزە باس دەکەم :

۱ ـ شێوەی پێکهاتنی کۆڕ

. . . . . . . . . . .

. . . . . . . . . . .

بە تایبەتی هەر لە عێراقدا گەلێك کەس هەن کە دەشیا ئەندامی کارای کۆڕ بوونایە . پێویستە کۆڕ لەگەڵ ئەوانە پێوەندی ببەستێ و ئەگەر داخوازی‌یان هەبوو ، داخوازی‌یەکانیان بۆ جێ بەجێ بکا تاکو ئەوانیش لەگەڵ کۆڕ کار بکەن . ئەز نێوی کەس نابەم تا نەڵێن لەبەر خاتری هاوڕێ‌یەتی یا دۆستایەتی یا خزمایەتی یا خۆشەویستی نێوی ئەوانە دەبات . . . . . . . . . . . .

هەروەها نابێ تا بەرهەمێکی باشتر هەبێ بەرهەمێکی باش بڵاو بکرێتەوە . بۆ وێنە کۆڕ دەچێ نامیلکەیەکی وەك « ڕێکەوت لە تەرازووی زیری‌دا » لەگەڵ ڕێزم‌دا بۆ خاوەنەکەی ، بڵاو دەکاتەوە ، کەچی فەرهەنگێکی کوردی ـ عارەبی مەزن کە خوالێ‌خۆش بوو گیوی موکریانی ژیانێکی پێوە بردووەتە سەر ، بڵاو ناکاتەوە . لە هەمووی حراپتر ئەوەیە یەکسەر بە خاوەنەکەشی ناڵێ برۆ بەرهەمەکەت بڵاو ناکەمەوە ، بەڵکو چەند ساڵێك دەیهێنێ و دەیبا و دەستی دەستی پێ دەکا و وێنەی فەرهەنگەکەی دەگرێتەوە و بێ ڕازی بوونی نووسەرەکەی لای خۆی گلی دەداتەوە و نایشێرێتەوە بۆی . نووسەری نەگبەتیش لە ژێر باری ئازار و خەفەت و پیش‌خواردنەوەدا دەناڵێنێ . لە

نامەیەکدا کە خوالێخۆش بوو پێش کۆچی دوایی‌ی بە چەند ڕۆژێك نووسی‌بووی بۆم و ئەوە دوا نامەیە کە لە ژیانی‌دا نووسیوێتی ، دەردی دڵی خۆی گێڕابووەوە بۆم و نووسی بووی کە کۆڕ ئاوای بێ‌کردم ، منیش پیر و نەخۆش و بێ‌کەس و بەزوانە دەمرم ... ئەم سکاڵایە کسپەی لە جەرگم هەستاند و . . . . . . . .

## ب ـ پلەی کارەکانی کۆڕ

. . . . . . . . . . . . . .
. . . . . . . . . . . . . .

لێرەدا تەنیا بۆ وێنە چەند شتێك دەخەمە بەرچاو کە وەك مشتێك لە خەروارێك وانە :

### ١ ـ هەڵەی زلە زلەی زمانەوانی

لێرەدا هەر بۆ وێنە چەند نموونەیەك دەخەمە بەر چاو :

١ ـ کۆڕی زانیاری لە ١٩٧٧دا فەرهەنگێکی بە ناوی « قامووسی زمانی کوردی »یەوە(×) بۆ کاك ئەوڕەحمانی زەبیحی لە چاپدا . ئەی ناکا کە کاك زەبیحی گەلێك ووشەی کە کورد بە کاریان ناهێنێ بە سەر کورددا سەپاندوونی . با لەوەش بگەڕێین کە کاك

---

(×) لەبەر نەبوونی ئەو تیپانەی لە ئیملای کۆڕدا بەکار دەهێنرێن لەم چاپخانەیەی ئەم گۆڤارەی لێ چاپ دەکرێ نەمانتووانی ئەو بەڵگانەی کە خاوەن ووتار تێیدا لە کارەکانی کۆڕ دەدوێ بە ئیملای کۆڕ چاپ بکەین ، بەڵکو ئیملا ڕاستە ستاندارده کوردی‌یەکەمان بەکار هێنا کە زانستگای بەغدا و هەموو دەزگا زانستی‌یەکانی کوردی تریش لە سەری دەڕۆن ، نەك لە ناوەوە بەڵکو لە دەرەوەی ووڵاتیش .

« گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات »

زەبیحی لە ژێر پەردەی ئەوەدا کە ووشـــەی تازە داتاشراوی بە دڵ نی‌یە ، چووە گەلێك ووشەی بیگانەی بەکار هێناوە کە بەرامبەرەکانیان لە کۆنەوە لە نێو زمانی کوردی‌دا هەن وەك : قاموس ، عامل ، لهجة ، فرق ، طبیعی ، فعل ، هنگامە ، سراسو ... هتـد . کـەچی چووە هێندێ ووشەی داتاشراوی کۆری بەکار هێناوە ... ئەمـــــانە هەمووی قەی‌ناکا و بۆ ئەو . بەڵام ئایە جێی داخ و خەفەت نی‌یـــە لە فەرهەنگێکی وادا کە د. ئەورەحمانی حاجی مارف کـە لای خۆی دوکتۆرای لە « زانـستی فەرهەنگ نووسینی کوردی »دا وەرگرتووە و بە ئاو و تاوەوە باسی فەرهەنگەکەی زەبیحی دەکا ، هەر لە لاپەڕەی یەکەمی‌یەوە لە سەر بنچینەی هەڵە دامەزرابێ ؟ بۆ وێنــە تــەواوی فەرهەنگەکەی زەبیحی بە بەشی ( هەمزە ) دراوەتە قەڵەم . لـــە لاپەڕە یەکدا دەڵێ : هەمزە دەنگێکە لە دەنگەکانی زمانی کوردی لـــە گەرووودا دێتە دەر ... هتد » . کەچی کە باسی (ئا) دەکا دەڵـــێ : « یەکەمین پیتی ئەلفوبێی زمانی کوردی‌یە کە بە خەتی لاتینـــــی بنووسرێ و دەنگێك پێشان دەدا کە لە تێکەڵاو بوونی ( هـــەمزە ) و ( ئەلف ) پێکهاتووە » ــ هەر ئەوێ .

لێرەدا پیاو هەر دەبێ بڵێ « هەمزە لە هەباسی چی ! » . ئـەو دەنگانەی کە کاك زەبیحی بە هەمزەیان دەزانێ یا بە هەمزە و ئـــەلف یا بە هەمزە و شتێکی دی‌یان لێ دەگـــا وەك ئا ، ئە ، ئو ، ئوو ، ئۆ ، ئی ، ئێ ، ئەمانە هەمزە نین . ئەمانە هەموو تیپی دەنگـــداری کورت و درێژن کــــە نیگـــــارە لاتینی‌یەکانیان بەم جۆرەیـــــە : a ، e ، u ، o ، ü ، î ، ê . هەمزە دەنگێکی تایـــــەتی یا جۆرە بزوێنەیەکی یەکجار کورتە لە عەرەبی‌دا کە لە بزرۆکە ( الکـــسرة المختلسة ( Marmel vokal )ی کوردی دەچێ . ئەم دەنگـــە لە هێندێ لەو ووشە عەرەبی‌یانەدا کـــــە هاتوونەتە نێو کوردی‌یەوە بووە بە ( ی ê ــ سەرنجی ( بئر ) بدەن کە بووە بە ( بیر ) ، یـا بووە بـــــە ( ێ e ــ سەرنجی ( مئزر ) بدەن کە بووە بـــە ( مێزەر ) . هەمزە لە ئامڕاز ( اداة ) ی ( نەء )دا هەیە کــــــە ئەویش لە بنچینەدا لە ( نها ) و ( نە ) و ( نۆ )وە هـــاتووە . ووشەی (ئاسمان) ، (ئەمە) ، (ئومێد) ، ( نووچ ) و ( ئۆخەی ) ، ( ئیش ) ، ( ئێش ) بە هەمزە دەست پێ ناکەن ، هەروها بـــــە

هەمزە و ئەلف یا هەمزە و واو و ... هتد دەست پێ ناکەن ، بەڵکو بە تیپی دەنگداری ê ، î ، o ، ü ، u ، e ، a دەست پێ دەکەن.
نووسینی ئەم دەنگانە بە هەمزە لە زمانی کوردیدا کارێك بوو لە سەرەتای پەنجاکاندا کرا بۆ ئەوەی لە هەڵکشاوی ( مدة ) و سەر ( فتحة ) و بۆر ( ضمة ) و ... هتد لە ووشەی آسمان ، احمەد ، اومێد و ... هتد ڕزگار بکرێن . جا با بڵێین کاك زەبیحی کە هەرچەندە مرۆڤێکی زۆرزانە و ئەمەی لێ تێکچوو ، ئەی چۆن دەبێ کۆڕێکی زانیاری زل و زەلام شتێکی وای لێ تێك بچێ !

ب- د.نەسرین فەخری[12] دەنووسێ کە (ن)ی چاوگی(نون‌المصدر) لە کوردیدا ئەم تیپانەیان پێش دەکەوێ : ا ( وەك سووتان ) ، ی ( وەك برین ) ، وو ( وەك چوون ) ، د ( وەك کردن ) ، ت ( وەك ڕشتن ) . ئاشکرایە کە (ن)ی چاوگی هیچ کاتێك تیپێکی بێ دەنگ ( حرف صامت Consonant )ی وەك (د) و (ت)ی ناکەوێتە پێشەوە . ئەو تیپەی کە پێش (ن)ی چاوگی کەوتووە لە ووشەی ( کردن ) و ( ڕستن )دا ئەوە ئەو تیپە دەنگدارەیە کە بزرۆکەی پێ دەڵێن . بەڵام کە ئەم دوو ووشەیە بە ئەلفوبێی لاتینی بنووسرێن بەم جۆرە Kirdin و Ristin ئەوسا بە تەواوی بۆمان دەر دەکەوێ کە تیپی پێش (ن)ەکە (نا)یە واتا تیپێکی دەنگدار ( بزوێن )ە نەك تیپی بێ دەنگ ( صامت )ی (د) یا (ت) .

ج - کۆڕ تیپی دەنگدار بە ( حرف صحیح وصامت )ی عەرەبی دەداتە قەڵەم[13] . ڕاستی‌یەکەی ( حرف صحیح ) و ( حرف صامت ) هەردووکیان یەکن و بێ دەنگن . لە کاتێکدا ( حرف علة ) دەنگدارە . واتا ( تیپە بزوێن ) و ( تیپی دەنگدار ) هەردووکیان یەك مانایان هەیە و یەکن . ئەوەی بزوێ ادەنگدارە و ئەوەی نەبزوێ بێ دەنگە .

ئەم هەڵە زلە زلانەی سەرەوە تەنیا نموونەیەکی کەم بوون بۆ ژمارەیەکی یەکجار زۆری لەم بابەتە کە ئەمانە لە زانستی زمانەوانی‌دا بە کفر دەژمێردرێن و هەرچی ئەلفوبێی زمانەوانی بزانێ نابێ بکەوێتە هەڵەی لەم جۆرەوە .

## ٢ – گۆڤاری کۆڕ

گۆڤاری کۆڕ دەبوو بەرزترین و باشترین گۆڤاری کوردی بێ ؛ بەڵام بە داخەوە وا نی یە . ئەو بابەتانەی لە نێو گۆڤارەکەدا بڵاو دەکرێنەوە بە پێی پرۆگرامێکی تایبەتی و نەخشەیەکی سنوور بۆ کێشراو نین : کۆڕێکی ئەکادیمی ی ڕاستەقینە ، نەك هەموو ساڵێك بە پێی ئامارێکی زانستانەی هورد ، جۆری ئەو بابەتانەی خەریکیان دەبێ و بڵاویان دەکاتەوە ، دیاری دەکا و هەر بە پێی ئەوەش پسپۆڕ بۆ ئامادە کردنی ئەو بابەتانە دەدۆزێتەوە ، بەڵکو ژمارەی ئەو لاپەڕانەش دەست نیشان دەکا کە بۆ هەر بابەت و هەر پسپۆڕێك تەرخان دەکرێ . ئەمەی ئێمە بە پێچەوانەوە ، بە هەوەس و ئارەزووی ئەوانە دەبرێ بەڕێوە کە زرووفی تایبەتی کردوونی بەکار بە دەست و ئەندامی کۆڕەکە . چی پێویستە و تا چ ئەندازەیەك و کێ بدۆزێنەوە بۆی تا بیکا ، باسی نی یە . بەڵکو ئەوا فیسارەکەس تۆ بوویتە ئەندامی کارا یا ئەندامی یارمەتی دەر دەبڕۆ چی دەزانیت و چۆنی دەزانیت و چەندی پێ ڕەش دەکەیتەوە بیکە ، ئازادیت . هەر لە بەر ئەوەشە کە کاك مەسعوود محەمەد کاتێك دەیەوێ ووتارێك لە سەر (ی) لە ڕێزمانی کوردی دا بنووسێ[١٤] یا لە سەر ( ڕاناو ) ووتارێك بنووسی[١٥] ، لە باتی ئەوەی هەوڵ بدا لە بابەتەکەی بدوێ ، دەچێ هەزار قسە و قسەڵۆکی وا دێنێتە پێشەوە کە نەك پێوەندی یان بە بابەتەکەوە نی یە و بەس ، بەڵکو تەنانەت پێوەندیشیان بە زمانەوانی یەوە نی یە ، بە کوردی ووتارێك کە دەیتوانی بە ٣–٤ لاپەڕە مەبەستەکەی بە تەواوی بدا بە دەستەوە ، ئەو (٧٥) لاپەڕەی لە سەر ڕەش کردووەتەوە و هێشتا دڵێشی ڕەحەت نەبووە . یا شێخ محەمەدی خاڵ دێنێ ووتارێك لە سەر جەمالەدینی ئەسەدئاوایی لە دوو ژمارەی گۆڤارەکەدا بڵاو دەکاتەوە و (٨٩) لاپەڕەی پێ دەگرێتەوە[١٦] ، لە کاتێکدا کە ئەم باسە چەند جار لە گۆڤار و ڕۆژنامە و کتێبە عەرەبی و فارسی یەکاندا بڵاو کراوەتەوە . شایانی باسە کە خواڵێخۆش بوو ئەسەدئاوایی کە بە « ئەفغانی » ناوی ڕۆیوە ، هەر چەندە لە ئەسەدئاوای کوردستانی ئێران و لە خێزانێکی کورد لە دایك بووە ؛ بەڵام لە کوردستاندا نەژیاوە و ڕاستەوخۆ خەریکی گۆڕین و پێشخستنی کۆمەڵگەی

کورد نەبووە ، لەبەر ئەوە جێی ئەو ووتارە گۆڤاری کۆڕ نەبوو . جا ئەگەر بهاتایە ووتارەکە لە جێیەکی دی بلاو بکرایەوە ، هیچ زیانێکی لە ڕێز و پایەی شێخی خاڵ نەدەدا ، چونکە خاڵێك کە نێزیکەی پەنجا ساڵ ژیانی خۆی بە خزمەتی زمان و کولتووری کوردەوە بردووەتە سەر و ڕێزی خۆی لەم بارەیەوە بە سەر هەموو لایەکدا سەپاندووە ، ئەگەر ئەو ووتارەی لە هەر کوێیەکی دیدا بلاو بکردایەوە ، جیاوازی نەبوو بۆ ئەو . هەر ئەم دووبارە کردنەوەیەی ئەو لە نووسینە نێو براوەکەی د. نەسرین فەخریشدا دەبینین کە لە بارەی « پاشگر و پێشگر »ەوە نووسیویێتی . جا ئەگەر خۆمان نەخلەتێنین هەموو ئەو بیروڕایانەی کە ئەو بە تازەی داناون و ویستوویەتی بیانخاتە ڕوو لە دوو لاپەڕەدا جێیان دەبووەوە . هەروەها ئەو ووتارە (٦٩) لاپەڕەیی‌یەی کە د. پاکیزە رەفیق حیلمی نووسیویێتی لە بارەی دەستوور سازی زمانی کوردی‌یەوە[١٧] ، کە لە کوێوە دەست پێ بکا و دەست پێ نەکا و لەوێشەوە کەوتووەتە باسی ئاڤێستا و هێندێ ئەلفوبێی ئاڤێستاییشی بۆ نووسیوینەتەوە ، جارێ ئەگەر ووتارەکە بۆ ئەوەیە باسی ئاڤێستا بکرێ ، ئەوا باسی ئاڤێستا لە سەدان و بگرە هەزاران کتێبدا بە زمانی جۆر جۆر کراوە . پیاو دەتوانێ بیانکا بە کوردی و بە کتێب بلاویان بکاتەوە . خۆ ئەگەر باسەکە بۆ ئەوەیە ( کە دەشیا وابێ ) پێوەندی‌ی زمانی کوردی بە ئاڤێستایی‌یەوە بخاتە بەر چاو ، ئەوا ئەو ووتارە هیچ دۆزینەوەیەکی نوێ،یا پێوەندی یەکی تازە دۆزراوەی ڕێزمانی کوردی بە ئاڤێستایی‌یەوە ناخاتە بەر چاو . وەرگێڕان لە زمانی بێگانەوە پێی ناڵێن لێکۆڵینەوە . لێکۆڵینەوە مانای وایە شتی تازە بابەت بهێنرێتە کایەوە . جا ئەگەر د. پاکیزە ڕەخنە لە ئەندامەکانی کۆڕ دەگرێ کە دەچن باسی فۆنێم و مۆنێم دەنووسن[١٨] و شتێك کە چەند سەد ساڵێکە خەڵکی گەبشتوویەتی ئەوان وەری‌دەگێڕنە سەر کوردی‌و بە حسێبی لێکۆڵینەوە دەیفرۆشن پێمان ، ئەوا ئەمەی ئەو دەیڵێ ڕاست دەکا و وایە ، ئەگەر چی ئەم قسانەی ئەو هەمووی بە زیادەوە و لە پێش ئەودا لە نامیلکەی « زمانی یەکگرتووی کوردی »دا کراون و ئەو بوخنەی ئەو قسانەی دووبارە کردووەتەوە ، لەگەڵ ئەوەشدا قسەیەکی هەقی کردووە . . . بەلام ئەی بۆچێ هەر خۆی چەند ساڵێك لەگەڵ ئەوانەدا کاری کرد و نقەی لێوە نەهات . دوایی بۆچی

هەر د. پاكیزە خۆی لە سەر داوودەزمیرەی ئەوان دەچێ بەڕێوە ، وەك لە ووتارە دەستوور سازییەكانیدا دەر دەكەوێ ؟ بێجگە لەوەش ئەگەر لە من دەپرسن لە كوێوە دەست بكەین بە دەستوور سازیی زمانی كوردی ، ئەوا ڕەپ و ڕاست دەڵێم لە زمانی كوردی خۆیەوە ، لە بەراورد كردنی شێوەكان و زارەكانییەوە بە یەكدی ، لە بەراورد كردنی جۆری دارشتنی ووشەكان و ڕستەكانی و جیاوازیی دەنگەكان ، هەروەها گەڕان بە دوای وێنە ڕاستەكانیاندا ، بە پێی دەستووری زمانەوانی . بۆ ئەوەی بتوانرێ ڕێزمانێكی یەكگرتوو دابنرێ كە بێ بە بنچینەی زمانێكی یەكگرتوو . جا لێرەدا بە داخەوە دەڵێم كە لەم ڕووەوە تەنیا یەك كار كراوە ئەوەش نامیلكەی نێوبراوی « زمانی یەكگرتووی كوردی »ی نووسەری ئەم ووتارەیە . لەوە بترازێ هیچ جۆرە هەوڵێك نەدراوە و نەكراوە . ئەمەش وەنەبێ شانازی بێ بۆ من بەڵكو جێی داخ و خەفەت و شەرمەزارییە ، كە ئەم هەموو قسە زل و بف هەڵدراوانە(١٩) دەكرێن و ئەم هەموو كاغەزە سپییە جوانانە ڕەش دەكرێنەوە و ئەم هەموو پارە زۆرە تەخشو پەخش دەكرێن ، كەچی تەنیا یەك كار لەم بارەیەوە دبارە ، ئەوەش ئیشی كابرایەكی دوور ووڵاتە كە كۆڕ لە « ڕووی پیاوەتی »یەوە خراپەكاری لەگەڵدا دەكات(٢٠) .

ئەمجا با بچینە سەر ووتارەكانی د. ئەوڕەحمان حاجی مارف ، بە تایبەتی ووتارەكەی لە سەر لێكسیكۆلۆژی زمانی كوردی(٢١) كە ووتارێكی یەكجار سادە و سەرەتایی و گاگۆڵكێ كەرانەیە . سەیر ئەوەیە لە لایەكەوە ئەو باسی ئێتمۆلۆژی زمان دەكا ، بەڵام لە لایێكی دییەوە و لە كاتێكدا كە ووشەی ( هشك ) و ( ووشك ) و ( ئەسپ ) و (هەسپ) لە پاڵ یەكەوە دەنووسێ ، كە ئەمەیان ڕاستە ، كەچی دەچی لە هەمان كاتدا ووشەی ( دامێن ) و ( داوێن ) و ( ما ) و ( مێ )یش هەر لە پاڵ یەكەوە دەنووسێ و هەر وەك ئەوانەی پێشوو بە كوردییان دەداتە قەڵەم و ئەمەش نێو دەنێ ( علم المفردات ) . لە كاتێكدا هەموو زمانەوانێك دەزانێ كە ( دامێن ) لە ( دامن )ی فارسییەوە هاتووە كە كوردییەكەی ( داوێن )ە ، هەروەها ( ما ) لە ( مادە )ی فارسییەوە هاتووە كە كوردییەكەی ( مێ )یە . بە پێی دەستووری زمانەوانیی

کوردی ، کاتێك تیبی بێ دەنگی (م) پیش تیپێکی دەنگدار بێ ، بـــە قایبەتی پێتی ( ئا ، ئە ، ئیـ ، ئـ ) لە نێوێك یا ئاوەلنێوێکـــی فارسیی تازەدا ، بە زۆری ئەو (م)ە لەو ووشە کوردییانەدا کـــە بەرامبەر ئەو ووشـــــە فارسییانەن وێنـــــەی (و) یا ( ڤ ) وەردەگرێ . وەك : دامن ، پیمودن ، خام ، نماز ، شـــــام ، نمودن ، هنگام ، مردم ، کمان ، نیم ، زمین ، بادام ، خمیـــر ، داماد ، نامو ... هندی فارسی وێنەی : داوێن ، پێوان ، خـــاو ، نوێژ ( نڤێژ ) ، شێو/ڤ ، نواندن ، هەنگاو ، مرۆڤ ، کـــەوان ، نیو/ڤ ، زەوی ، باوی ، هەویر ، زاوا/زاڤا ، نێو ( ناو/ڤ ) و ... هتد لە کوردیدا وەردەگرن . جا ئەم دەستووره تەنیا بۆ ئـــــەو ووشانە نییە کە خۆمالین و بنەڕەتیان یەکە ، بەلکو هێندێ جـــار ووشەی بێگانەش دەگرێتەوە کە بکەونە هەر دوو زمانەکـــەوە . بۆ وێنە ووشەی تمام ، سلام ، جماعة ، خیمة ، یتیم ، درهم لـــــە فارسیدا هەر وەك خۆیان ماونەتەوە ، کەچی لە کوردیدا بوون بـــە : تەواو ، سلاو/ڤ ، جڤات ، خێوەت ، هەتیو ، دراو/ڤ . لە بـــەر ئەوە ( داوێن ) کوردییە و ( دامێن ) کوردی نییە .

یا دەبینین کە کاك محەمەد ئەمین هەورامانی هەر لە خۆیەوە دەلێ : « زمانی ئاوێستا بە زمانی میدی نووسراوە و ووتراوە »[٢٢] . وا بزانم ئەوانەی لە کۆڕدا کار دەکەن ئەوە نازانن کە تا ئێستـــــە تاقە تێکستێك بە زمانی میدییەکان نەدۆزراوەتەوە . ئەوەی کـــــە لەو زمانە دەزانرێ تەنیا چەند ووشەیێکە کـــە ئەویش لـــــە ڕێی زمانەکانی دییەوە بۆمان ماوەتەوە . نازانم کاك هەورامانی ئـــــەم قـــەیەی کە کوێوە هێنا و کۆڕ چون بۆی سەلماند ؟!.

٣ ـ ڕێنووســی کۆڕ

ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە ئەلفوبێی کوردی لە ئەلفوبێیەکـــــی عەرەبی ـ فارسی دەسکاری کراوەوە هێنراوەتە بوون و بڕ بـــــە بێستی دەنگەکانی زمانی کوردی نییە و گەلێ کەموکووڕی و ناتەواوی تێدایە کە هێندێکیان بە هیچ جۆرە دەستکاری کردنێك چارەســـەر ناکرێن[٢٣] . بەلام دەردی کوردەکە دەلێ : « ڕێوی خۆی بـــــە

کونەوە نەدەچوو هەژگیش بوو بە کلکی‌یەوە » . کۆڕی زانیاری هەستا کەوتە دەستکاری ئەم ئەلفوبێ‌یە و بەوە زێتر سەری لە خەڵك شێواندا . لێرەدا ناتوانم بە دوور و درێژی باسی هەموو ناتەواوی‌یەکانی ئەم ڕێنووسە بکەم ، بەڵام وا هەر بۆ نموونە چەند شتێك دەخەمە بەر چاو ، لەمانە :

( یی‌ی درێژ ) واتە (î) بە ( ی ـ خەتێکی لە سەر ) لە جیاتی (یی) دەنووسێ و ( واوی درێژ ) واتە (ū) بەم جۆرە ( و ـ خەتێکی لە سەر ) لە جیاتی ( وو ) دەنووسێ کە ئەمەش خۆی لە خۆی‌دا لاسایی‌یەکی ناشی‌یانەی تیپی لاتینی‌یە . چونکە جارێ (و) تەنیا نیگاری تیپی دەنگداری کورت ( واتە u )نی‌یە ، تا پیاو بێ و بە سەر ( فتحة )ێك بیکاتە تیپی دەنگداری درێژ . ( و ) جارێك لە جیاتی u وانا بەرامبەر بە بۆر ( ضمة )ی عەرەبی و جارێکی دیش لە جیاتی (W) واتە بەرامبەر بە ( واو )ی عەرەبی بەکار دەهێنرێ ، کە یەکەمیان ، واتە u ، تیپێکی دەنگدار vocal ی کورتە ، بەڵام دووەمیان واتە (W) تیپێکی نیوە دەنگدارە Semi vocal . بۆ وێنە : (و) لە ووشەی ( وەرە Were )دا لەگەڵ (و) لە ووشەی ( کورد Kurd )دا یەك نین ، واتە یەك دەنگ نین و جیاوازن . یەکەمیان وەك ووتمان تیپێکی نیوە دەنگدارە (W) و دووەمیان تیپێکی دەنگداری کورتە ( u ) . هەروەها تیپی (ی) بە تەنیا تیپێکی دەنگداری کورت نی‌یە ، تا پیاو بێ و بە سەر ( فتحة )ێك بیکاتە تیپی دەنگداری درێژ (یی) . (ی) جارێك لە جیاتی (î) لە نەختێك لە ژێر ( کسرة )ی عەرەبی درێژترە بەکار هێنرێ و جارێکی دیش لە جیاتی (y) بەکار دەهێنرێ کە دەنگەکەی لە دەنگی (ی)ی عەرەبی دەچێ . یەکەمیان ( واتە î ) تیپێکی دەنگدارە و دووەمیان ( واتە y ) تیپێکی نیوە دەنگدارە . بۆ وێنە ( ی ) لە ووشە ( تیر tîr )دا لەگەڵ (ی) لە ووشەی ( یار yar )دا یەك نین و جیاوازن . یەکەمیان وەك

ووتمان ، تیپێکی دەنگداری درێژە (î) و دووەمیان تیپێکی نیوە دەنگدارە (y) . لە ووشەی ( دیاری diyarî)دا هەر دوو جۆری (ی) کە بە جوانی دەبینرێ .

بێجگە لەوەش دانانی چوکلە لە سەر (ر) بۆ کردنی بە ڕێی قەلە و لە باری هونەری‌یەوە ناڕاستە چونکە چوکلە خستنە سەر (ر) وا لە (ر)کە دەکا کە لە نووسینی‌دا لەگەل (ز) و ( ژ ) « بە تایبەتی ژ » لە یەکدی بگۆڕێن و ڕێنووسەکە زەحمەتتر بکات لە بەر ئەوە چوکلەکە هەر لە ژێر (ر)کە دا « بەم جۆرە (ڕ) »بمایەوە چێتر بوو . هەروەها (ی)ی ئانە پاڵ ( الاضافة ) باش (ی)ی درێژ پێویست بوو بمابەوە وەك لە بەرگی دووەمی بەشی یەکەمی گۆڤاری کۆڕ ( ل ١٣٤-١٤٤ )دا باسم کردووە . دوای ئەمە هەموو ( ر )یەك کە لە سەرەتای ووشەوە بێ لە کوردی‌دا قەلەوە ، کورد هیچ کاتێك دەم بە ڕێی لاواز ناکاتەوە ، لە بەر ئەوە ئەو (ر) یانەی لە سەرەتای ووشەوە دین پێویست ناکا چوکلە بخرێتە سەریان چونکە لە کەس تێك ناچێ( × ) . ئەمەش وەك ماتماتیك وایە . بۆ وێنە کە لە ماتماتیکدا نووسیت (٤) یا (س) ، ئەوە مانای + ٤ و + س دەگرێتەوە ، لەبەر ئەوە دانانی نیشانەی ( + ) لە پێش (٤)ەکە یا (س)کەوە پێویست نی‌یە .

ئا لەبەر ئەم هۆیانە و گەلێ هۆی دی دەسکاری کردنی ڕێنووسە کوردی‌یەکەمان لە لایەن کۆڕەوە و بەو شێوە ناشی‌یانەیەی سەرەوە لە تێکدانی ئەلفوبێکە بەولاوە هیچی دی نەبوو .

---

( × ) ئەمە ڕاستە (ر)ی سەرەتای ووشە هەمیشە قەلەوە ، بەلام هەر لە بەر ئەوەی (ڕ)ی قەلەو و (ر)ی لەڕ لە کوردی‌دا هەیە و لە یەکتری جودا کراونەتەوە ، پارێزگاری کردنی دەنگەکان لە جێی خۆی‌دا کارێکی مەنتیقی و بەجێ‌یە ، لە بەر ئەوەیە (ر) با لە سەرەتای ووشەش بێ هەر بە قەلەوی بنووسرێ ڕاستترە .

( گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات )

## ٤ ـ زاراوەکانی کۆڕ

وەك لەمەوبەر باسمان کرد یەکەمین هەوڵدان بۆ دانانی زاراوەی زانستی بۆ زمانی کوردی لە ساڵانی ١٩٥٢–١٩٥٣دا دراوە و یەکەمین هەوڵدان بە کردەوە ئەو فەرهەنگۆکە زانستانەیە کە بۆ کتێبی « سەرەتای میکانیك و خۆماڵەکانی مادە »ە لە ١٩٥٧دا تەواو بووە و لە بەهاری ساڵی ١٩٦٠دا کەوتووەتە بەردەست خوێنەرەوە . هەر پاش ئەمەش بە ماوەیەکی کورت نامیلکەی « هەندێك زاراوەی زانستی » خراوەتە بازاڕەوە . پاش بڵاو کردنەوەی ئەم دوو بەرهەمە ئەوجا « نەقابەی مامۆستایانی سلەیمانی » لە سەر بنچینەی ئەو دوو کارە نامیلکەی خۆی بڵاو کردەوە و ژمارەیەکی زۆر لەو زاراوانەی وەرگرت کە لەو دوو بەرهەمەدا بەکار هێنرابوون یا دانرابوون ، بێ ئەوەی بە هیچ جۆرێك باسی سەرچاوەکانیان بکات. جا لەبەر ئەوەی « نەقابە » هێندێك لەو زاراوانەی بە هەڵە وەرگرتبوو ، بێجگە لەوەش ژمارەیەکی یەکجار زۆری ئەوانەی خۆی دروستی کردبوون ، کاڵو کرچ و ناشیانە بوون ، ناچا بووم هەڵەکانی لە گۆڤاری « ڕۆژی نوێ »دا کە هاوڕێی منالی و خۆشەویستم جەمال شالی دەری دەهێنا ، ڕاست بکەمەوە[٢١] . خۆ ئامادە کردنم بۆ هاتنە ئەوروپا و پاش ئەوەش داخستنی گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ڕێی ئەوەیان گرت کە ئەو زنجیرە ووتارە تەواو بکەم . هەرچی چۆنێك بێ مێژووی ڕاستەقینەی دانانی زاراوەی زانستی لە زمانی کوردیدا لەو فەرهەنگۆکە زانستییەوە ، دەست پێ دەکا کە بۆ کتێبی « سەرەتای میکانیك و خۆماڵەکانی مادە » نووسراوەتەوە. « کۆڕی زانیاری » دەیەوێ ئەم ڕاستییە بشارێتەوە و تێکی بدا و مێژووی زاراوەی زانستانەی کوردی بە هەڵە پێشکەش خەڵك بکات، وەك لە ووتارەکەی د. ئەوڕەحمان حاجی مارفدا دەردەکەوێ کە هیچ باسی ( فەرهەنگۆکی فیزیك )ەکە ناکات .

جا ئەگەر بێتو پێش دەرچوونی ئەو ( فەرهەنگۆکی فیزیك )ە و ( هەندێك زاراوەی زانستی ) لەم لاو لەولا و لەم فەرهەنگ و لەو فەرهەنگدا چەند ووشەیەکی زانستانە بە ڕێکەوت لە عەرەبییەوە کرابن بە کوردی ، ئەوانە هیچیان بە ئامانجی دانان و دروست کردنی

زاراوەی زانستانەی فیزیك و ماتماتیك و گیانەوەرناسی‌و ... هتد نەبوون . لێرەدا مەبەستم ئەوە نی‌یە لە سەر کارەکانی خۆم بکەمەوە ، ئەوە مافێکی ڕەوای خۆمە و هەر کەسێك ویژدانی بیێ دان بەوەدا دەنێ ، بەلام بەر لە هەموو شتێك دەمەوێ ئەوە بخەمە پێش چاو کە کۆڕ چاوی بە هەوڵ و تەقەلای ئەوانە هەڵ نایەت کە ساڵان و مانگان و لە ڕۆژانی ڕەشدا مازووری کێشانە کاریان کردووە لە پێناوی خزمەتی ووشەی کوردی‌دا ، بێ ئەوەی بە مووچەی زۆرەوە و لە ژووری گەرمونەرمدا دانیشتبن و بەردەست فرکان فرکان چاو قاوەی هێنابنەتە بەر دەم و بە دوکتۆر دوکتۆر و مامۆستا مامۆستا قسەی لەگەلدا کردبن .

هەر چەندە ئەم ووتارە جێی ئەوە نی‌یە کە زاراوەکانی کۆڕ لە سەرەوە تا خوارەوە لە بێژنگ بدەم . چونکە ئەوەم هەلگرتووە بۆ کاتێکی دی و شوێنێکی دی . بەلام ئەوا لە گۆڤاری کۆڕ ( نمرەیەك ـ نمرەشەش )ەوە ، ژمارەیەك لەو زاراوانە وەردەگرم و دەیان خەمە بەردەست هەموو زانایەکی دلسۆزی گەل تا بزانن ئەوانەی ئەم زاراوانەیان بۆ کۆڕ دروست کردووە و بە سەر زانستدا سەپاندوویانن ، بە کەلکی ئەم کارە نەهاتوون . هەموو مرۆڤێکی بە ئینسافیش مافی ئەوەی هەیە حسێبێك لەگەڵ ئەوانەدا بکا کە فەرمانی خۆیان بە ڕاستی و دروستی بەجێ ناگەیەنن .

١ ـ بەرگی یەکەم ـ بەشی یەکەم ، ١٩٧٣،ل٤٢٣ ـ ٥٢٥

١ ـ لە جیاتی ( اجازة ) « ووچان » دانراوە . « ووچان » بە عەرەبی « فترة راحة قصيرة » و هەروەها ( مهلة )یە کە لە کوردی‌دا بووە بە ( مۆلەت ) . کورد دەلێ : « چەند ڕۆژێك ووچانم بدە »واتە « مۆلەتم بدە » . ( اجازة ) بە مانای « ڕێ پێ دان »دێ . خۆ ئەگەر مەبەست لە ( اجازة ) ئەوە بێ کە فەرمانبەرێك چەند ڕۆژێك ڕوخسەت بخوازێ و کار نەکا و بحەسێتەوە ، ئەوا بەوە دەلێن « سیلە » . بۆ وێنە دەلێن : « ئەسکەرەکە دوو هەفتە سیلەی خواستووە و هاتووەتەوە بۆ سەردانی کەسوکاری » .

٢ ـ لە جیاتی ( استعلامات ) « پرسگە » دانراوە . (استعلامات)

لە زمانی عەرەبی‌دا گەڵ ( جمع )ی ( استعلام )ە . بەڵام « پرسگە » جێی پرسی درایە . لەبەر ئەوە « پرسگە » دەبێتە ( محل الاستعلامات )یا ( دائرة الاستعلامات )نەك ( استعلامات ) .

٣ ـ لە جیاتی ( اطاعة ) « گوێداری » دانراوە ، کەچی لە زمانی کوردی خۆی‌دا « گوێ دێری »لە کۆنەوە هەیە . پاشکۆی « داری » لە « دارا » و « داشتن »ی فارسی‌یەوە هاتووە . کوردی‌یە ڕاستی‌یەکەی « دێری »یە وەك چۆن بۆ ( تفقد ) « چاودێری » هەیە ، نەك « چاوداری »[٢٥] .

٤ ـ بۆ ( نقابة ) « جڤات » ووشەیەکی کرمانجی‌ی ژووروە کە لە « جەماعەت » ( جماعة )ی عەرەبی‌یەوە وەرگیراوە[٢٦] . « جڤین » لە بنەڕەتدا « جەمعین »بووە و بووە بە « جەڤمین » و ئەوجا « جڤین » . « جڤین » بە مانای « کۆبوونەوە » و « جڤات »یش بە مانای « کۆمەڵ » دێ ، لە کاتێکدا ( نقابة ) شتێکی دی‌یە و نێوی کۆمەڵێکی پیشەیی‌یە ، نەك هەموو کۆمەڵێك .

٥ ـ بۆ ( عدم محکومیة ) « بێ تاوانی » دانراوە ، ( عدم محکومیة ) بارێکی قانوونی‌یە بۆ ناساندنی حاڵەتی کەسێك لە لەلایەن دادگاوە حوکم نەدرابێ بەسەری‌دا . « بێ تاوان » مانای نەبوونی تاوانە . هەر کەسێك حوکم درا بە سەری‌دا مەرج نی‌یە لە ڕاستی‌دا تاوانبار بێ یا کە حوکم نەدرا بە سەری‌دا مەرج نی‌یە لە بنەڕەتدا بێ تاوان بێ . « بێ تاوانی » مانای « بێ جورمی »یە .

٦ ـ بۆ ( رصاص ) « مز » دانراوە . جارێ « مز » ڕاست نی‌یە ، بەڵکو « مس » ڕاستە ، ئەگەر بە تەنیا بوو . بەڵام ئەگەر « مز » بوو بە بەشێك لە ووشەیەك ، وەك « مزگەری » ئەوا هێندێ جار دەنگی ( س ) دەبێتە ( ز ) . دوایی « مز » بە عەرەبی ( نحاس )ە نەك ( رصاص ) . وا دیارە بە ناشکوری نەبێ عەرەبی‌یەکەشمان لە بیر چووەوە و کوردی‌یەکەش فێر نەبووین .

٧ ـ بۆ ( تقصیر ) « درێغی » دانراوە ، « درێغی » ڕاست نی‌یە ، « درێخی » ڕاستە[٢٧] .

٨ ـ بۆ ( تعويض ) « بژاردن » نووسراوه . « بژاردن » ( تنقيح )ه نەك ( تعويض ) . ( تعويض ) « بژاردنەوه »يە . کورد دەڵێ : « هەمووی بۆ دەژمێرمەوه » .

٩ ـ بۆ ( تضامن ) « هاونەرك » و بۆ ( متضامن ) « هاونەرکی » دانراوه . لێرەدا هەردووکیان بە پێچەوانەوه بەکار هێنراون .

١٠ ـ بۆ ( تزكية ) « پەسند » نووسراوه . « پەسند » بۆ ( تزكية ) ڕاست نی‌یە . گریمان « پەسند » لێرەدا ڕاستیش بێ ، ئەو حەڵە بۆ ( تزكية ) دەبێ « پەسندکاری » و « پەسندکردن » دابنرێ نەك « پەسند » .

١١ ـ لە جیاتی ( محو الامية ) « نەهێشتنی بێ سەوادی » دانراوه . « بێ سەوادی » لە ( بیسوادی )ی فارسی‌یەوه وەرگیراوه کە ئەویش لە ( بی ) ئێرانی و ( سواد ) ی عەرەبی‌یەوه هاتووه . ( سواد ) مانای « ڕەشایی »یە بە عەرەبی . تێ ناگەم ئێمە لە کۆنەوه بەرامبەر ( أمی ) « نەخوێندەوار » و بەرامبەر ( امية ) « نەخوێندەواری »مان هەیە ، بۆچی دەبێ بنێشین بە « بێ سەوادی »یەکی نیوە فارسی و نیوە عەرەبی‌یەوه ؟ .

١٢ ـ لە جیاتی ( مجسمة ) « بەرجەستە » دانراوه . « بەرجەستە » خۆی بە تەنیا مانای نی‌یە . لە فارسی‌دا ووشەی ( برجسته ) هەیە کە بە مانای « گەوره » و « زل » و « بەنێو بانگ »بەکار دێ . سەیر ئەوەیە لە بەرگی دووەم/بەشی دووەم ١٩٧٤ ، ل ١٨٤ بۆ ( مجسم/مجسمة ) « بارستە » دانراوه . لە کاتێکدا لە بەرگی یەکەم/بەشی یەکەم ١٩٧٣ ، ل ٤٦٢ « بارستە » بۆ « حجم » بەکار براوه . جارێ « مجسم » کە لە « جسم » واتە ( تەن )ەوه هاتووه لەگەڵ ( حجم ) یەك شت نین و هەر کەسێك ئەلفوبێی فیزیك بزانێ ئەمەی لێ تێك ناچێ . دوایی « بارست » و « بارستایی » بۆ ( كتلة ) ڕێك دەکەون نەك بۆ ( حجم ) . چونکە ( حجم ) پێوەندی بە بارستایی شتەکەوه نی‌یە ، بەڵکو بە ( قەواره ) یا ( قەواڵە )ی ئەو شتەوه .

۱۳ ــ بۆ ( لفظ ) « واژە » و بۆ ( لفظی ) « واژەیی » دانراوە . کەچی لە بەرگی‌دووەم/بەشـــی دووەم ، ۱۹۷٤ ، ل ۱۷۹ــ۱۸۰ بۆ ( لفظ ) « بێژە » و بۆ ( لفظی ) « بێژەکی » دانراوە ، هـــەروەها لە بەرگی چوارەم ۱۹۷٦ ، ل ۸٤ ) بۆ ( اللفظیة ) « بێژەیی » دانراوە. وا دیارە ئەوانەی ئەمەیان داناوە نەك تەنیا نەیان‌زانیوە کـــە ( واژە ) ووشەیەکی فارسی‌یە و لە جیاتی « ووشە » ( کلمة ) بەکار دەبرێ ، بەڵکو بیری ئەوەشیان نەبووە کە ( لفظ )یان بە سێ جۆر پـــێ فرۆشتووین . ئەمجا بۆ ( لفظ ) لە کوردی‌دا هێندێ ووشە هەن کـــە هیچ باس نەکراون ، وەك « وورتە » . دەڵێ : کابرا وورتەی لێـوە نەهـــات .

## ب ــ بەرگی دووەم/بەشـی یەکەم ، ۱۹۷٤ ، ل ۸۹۹ــ۹۳۹

۱ ــ بۆ ( توازن ) « هەمبەری » بەکار هێنراوە . جـــارێ « هەم » پێشگرێکی فارسی‌یە و لە جیاتی « هاو » یا « هـــەف »ی کوردی بەکار دێ(۲۸) وەك ( همراه ) فارسی و ( هـــاورێ )ی کوردی ، ( همسایە )ی فارسی و ( هاوسێ )ی کوردی و ...هتد. دوایی ( توازن ) ئەوەیە دوو لا یا چەند لایەك سەنگ و سووکی‌یـان ئەوەندەی یەك بێ واتا هاوسەنگی یەك بن . ( توازن ) «هاوسەنگی»یە نەك « هاوبەری » کە بە مانای « بەرامبەری » دێ . چونکە دەشـــێ دوو هێز یا دوو چەندێتی ( کمیة ) بەرامبەر یەك دانرابن ، بـــەڵام هاوسەنگی یەك نەبن . سەیر ئەوەیە هەرچەند دێرێك دوای ئـــەوە بۆ ( توازن ) ( توازن الثقل ) « هاوسەنگ » دانراوە . ئەمە ئـــەوە دەگەیەنێ ئەوانەی ئەمەیان داناوە سەریان لە عەرەبیش دەرنەچووە ، چ جایەکی کوردی‌یەکەی خۆیان و زانستی فیزیك ، ئەگینا ( توازن ) و ( متوازن ) لە باری ڕێزمانەوە یەك شت نین .

۲ ــ بۆ ( توجیە ) « ئاڕاستن » و بۆ ( وجە ) « ئاڕاستی » و بۆ ( یوجە )« دەئاڕێزێ » دانراوە کە پێی ناوی لە ســـەری بڕۆم « ئاڕاستن » و « ئاڕاستی » و « دەئاڕێزێ » بە زمـــانی هیـــچ کوردێکدا نەهاتووە تا ئێستە . لە کوردی‌دا « ئاڕاســـتە کردن » و « ئاڕاستەی کرد » و « ئاڕاستەی دەکا » هەیە . وەك چۆن لـــە

کوردی‌دا « چه‌ور کردن » و «چه‌وری کرد» و « چه‌وری ده‌کا »هه‌یه. نه‌ك : « چه‌وری » و « ده‌چه‌ورێ » . مه‌گه‌ر ئه‌وه‌ی کۆڕ بـــه قووره‌تی خۆی زمانێکی تازه‌مان بۆ بنیاد بنێ .

٣ ــ بۆ ( تیار ) « پێل » دانراوه . « پێل » به مـــــاناى « شه‌پۆل » دێ له شێوه‌ی کرمانجی‌ی ژووروودا ، نه‌ك ( تیــار ) . « موج » و « تیار » یه‌ك شت نین . به‌لام له به‌رگی سێ‌یه‌مــــدا بۆ ( تیار ) « ته‌زوو » نووسراوه ، بێ ئه‌وه‌ی سه‌رچاوه‌ی ووشه‌کـــه باس بکا که بۆ یه‌که‌مجار له « سه‌ره‌تای میکانیك و خۆماڵه‌کـــانی ماده »دا(٢٩) ، هه‌روه‌ها له « هه‌ندێك زاراوه‌ی زانســـتی »دا(٣٠) « ته‌زوو » بۆ ( تیار ) به‌کار هێنراوه . ئێسته دڵنیام ئه‌گه‌ر ئـــه‌م ووشه‌یه بۆ یه‌که‌مجار میسته‌ر ئێدمۆندس به‌کاری بهێنایـــه ، کۆڕ له چه‌ند جێگه‌یه‌کدا به ئه‌وپه‌ڕی ڕێزه‌وه نێوی ده‌برد ، وه‌ك لـــه گه‌لێ شوێندا براوه .

٤ ــ بۆ ( سخن ) « ده‌هنده » و « به‌خشنده » دانراوه کـــه یه‌که‌مان به قالبی فارسی داڕێژراوه و دووه‌مـــان فارسی‌یه‌کی ڕووته . ( سخــن ) وه‌ك خۆی بمایه‌وه گه‌لێك باشتر بوو .

٥ ــ بۆ ( الطبقة العامة ) « چینی ڕه‌مـــه‌کی » دانــــراوه . « ڕه‌مه‌کی » له کوردی‌دا به ماناى ( عام ) نایه‌ت ، به‌لکو به مـــاناى ( فطری ) و ( غریزی ) و ( تطور نه‌کردوو )دێ . « ڕه‌مــــه‌کی » وێنه‌یه‌کی دی « ڕه‌وه‌کی »یه .

٦ ــ بۆ ( قطب ) « ته‌وره » دانراوه . « ته‌وره » له‌کوردی‌دا بۆ (محور) به‌کاردێ نه‌ك بۆ (قطب). ئه‌گه‌ر به هوردی سه‌رنجی « ته‌وه‌ره‌ی ده‌ستاڕ » بده‌ین ئه‌م ڕاستی‌یه‌مان بۆ ده‌ر ده‌که‌وێ .

٧ ــ بۆ ( مبادرة ) « پێش ده‌ستی » دانراوه . له کاتێکـــدا بۆ ( مبادرة ) ووشه‌ی « ده‌ست پێشکه‌ری » هه‌ر له کۆنه‌وه له نێـــو کورده‌واری‌دا هه‌یه . ده‌ڵێ : « کابرا ده‌ستی خۆی پێش خســـت و کاره‌که‌ی کرد » .

٨ ـ بۆ ( متوازی ) « هەمبەر » دانراوە . لەوە پێشیش دیمان کە بۆ ( توازن ) « هەمبەری » دانرا بوو ( سەیری ل ١٦ ، ژمارە ا بکە ) . وەك ووتمان « هەمبەر » کوردی نی‌یە و فارسی‌یە و مانای ( بەرامبەر ) یا ( هاوبەر ) دەگرێتەوە نەك ( متوازن ) . ئەمجا ( متوازی ) و ( متوازن )یش یەك نین تا بۆ هەردووکیان « هەمبەر » دابنێین . ( متوازن ) وەك گوتمان « هاوسەنگ »ە . بەلام ( متوازی ) بە دوو هێڵ یا دوو ( مستوی ) دەڵێن کە هاورێکی یەك بن « هاورێك = متوازی »یە[٣١] .

٩ ـ بۆ ( مقیاس ) « پێودان » دانراوە . « پێودان » لە « پێ و دانگ »ەوە هاتووە . « پێ و دانگ »یش بە مانای ( نمط )ی عەرەبی دێ نەك ( مقیاس ) . ( مقیاس ) « پێوەر » دەگرێتەوە .

١٠ ـ بۆ ( ملاحة بحریة ) « دەریاوانی » دانراوە . « دەریا » فارسی‌یە کوردی‌یەکەی « زەریا »یە .

١١ ـ بۆ ( موزع ) « نامەبەر » دانراوە . « نامەبەر » ئەو کەسەیە کە پۆستە دابەش دەکا بە سەرماڵاندا . ( موزع )یش کەسێکە کە شتێك دابەش بکا کە مەرج نی‌یە پۆستە بێ . کەواتە ( موزع ) « دابەشکەر »ە ، نەك « نامەبەر » .

١٢ ـ بۆ ( ازعاج ) ووشەی قورسی « جارز کردن » دانراوە کە وێنەیەکی دی « وەڕس کردن »ە . کەچی ووشەی « بۆڕۆ کردن » کەوا بزانم لە هەڵەبجە زۆر بەکار دێ نەنووسراوە .

١٣ ـ بۆ ( اساس البناء ) « بناغە » دانراوە کە ڕاستی‌یەکەی وەك لە سەرەوە باسمان کرد ( بناخە )یە .

١٤ بۆ ( تسویق ) « بازاڕکاری » دانراوە کە ( بازاڕ ) ووشەیەکی فارسی ڕووتە و کوردی‌یەکەی « بازڕ »ە کە لە هەولێر و سەرووی کوردستان بەکار دەبرێ[٣٢] .

بەرگی دووەم/بەشیدووەم ١٩٧٤ ، ل ١٧٠–٢١٨

١ – بۆ ( شعور ) « هەست » و بۆ ( لا شعور ) « نەست » دانراوە . « هەست و نەست » لە ( هست و نیست )ی فارسییەوە هاتووە کە بە مانای « هەبوو و نەبوو »دێ نەك ( شعور ) . « هەست » لە کوردیدا کە بەرامبەر بە ( شعور )ی عەرەبییە و لە ل١٩٧دا ڕاست بە کار هێنراوە لە ( حاسە )ی عەرەبی ( حاسەت )ەوە هاتووە.

٢ – بۆ ( قاسم ) « دابەشین » بەکار هێنراوە . لە کاتێکدا « دابەشین » ( تقسیم )ە نەك ( قاسم ) . ( قاسم ) مانای دابەشکەرە.

٣ – بۆ ( کتلة ) « قەوارە »یان داناوە . لە کاتێکدا « قەوارە » ( حجم )ە نەك ( کتلة ) . ( کتلة ) « بارستایی »یە . « قەوارە » یا « قەوالە » بۆ ( حجم ) بەکار دێ . کورد دەڵێ هەر قەوالەکەی ماوەتەوە واتە پێستەکەی و بۆشاییەکەی نێوی، واتە ( حجم )ەکەی.

٤ – بۆ ( مباشر ) « ڕاستەوخۆ » بەکار هێنراوە و بۆ ( غیر مباشر ) « تیان » . لە کاتێکدا « ناڕاستەوخۆ » یا « نایەکسەر » گەلێك لە « تیان » باشتر بوو .

٥ – بۆ ( هندسة المجسمة ) « ئەندازەی بارست » دانراوە . لە کاتێکدا بۆ ( مجسمة ) لە شوێنێکی دیدا ( بەرجەستە ) بەکار هێنرا بوو . ڕاستییەکەی ( هندسة المجسمة ) « هەندەسەی بۆشایی »یە و پێویستی بە بارست و مارست و بەرجەستە و مەرجەستە نییە !

٦ – بۆ ( جراح ) « برین ساز » و « برین گەر » دانراوە و لە شوێنێکی دیدا « نۆدار » بەکار هێنراوە . « نۆدار » بۆ ( جراح ) بۆ یەکەمجار لە لایەن ئێمەوە بەکار هێنراوە و بە « زشتەردار » لێکدراوەتەوە . کە کۆڕی بەرێز سەرچاوەکەی باس نەکردووە وەك ژمارەیەکی زۆر لەو ووشانەی لە بەرهەمەکانی ئێمەوە وەریگرتوون .

٧ ـ بۆ ( منی ) « تۆم »ی بەکار هێناوە . لە کاتێکدا « تۆم » و « تۆو » هەردووکیان هەر یەکن . « تۆم » لە ( تخم )ی فارسی‌یەوە وەرگیراوە کە بە مانای ( تۆو ) دێ(٣٣) . لە بەر ئەوە « تۆمدان » بۆ ( الحویصلة المنویة ) ـ ل١٩٩ ، ڕاست نی‌یە بەڵکو ( تۆودان ) ڕاستە.

٨ ـ بۆ ( الحیویة ) « ژی » و « زیندەگی » بەکار هێنـاوە . ( ژی ) لە کوردی‌دا نی‌یە . ( زیندەگی )ش ووشەیەکی فارسـی‌ی ڕەسەنە کە بە مانای ( ژیان ) = الحیاة دێ ، نەك ( الحیویة ) .

٩ ـ بۆ ( رج ) « ژاندن » بەکار هێنراوە . « ژەندن » ڕاستە نەك « ژاندن » .

١٠ ـ بۆ ( طفیلی ) « مێمل » بەکار هێنراوە . « مێمل » لـە کوردی‌دا بە مانای ( منافس ) دێ نەك ( طفیلی ) . کورد دەڵـێ : فیسارەکەس مێملی بۆ پەیدا بوو ، واتە ( منافس )ی بۆ پەیدا بوو . بەرامبەر ( طفیلی ) « لاڕەسەنگ » و « چەلومل »مان هەیە .

١١ ـ بۆ ( الاعصاب الحرکیة ) « بزوێنـە ڕەگ » دانراوە و بۆ ( الاعصاب الدماغیة ) « ڕەگە مێشك » . ئەگەر ئەمانە ڕاستیش بـن دەبێ یەکەمیان « ڕەگەبزوێن » بێ نەك « بزوێنە ڕەگ » . وەك چۆن دووەم بە « ڕەگە مێشك » دانراوە ، دەبێ یەکەمیش وابـێ . زاراوە دەبێ یەك ڕەنگ بێ ، نابێ بانێك بێ و دوو هەوا .

١٢ ـ بۆ ( مستطیل ) « تەژە » دانراوە . لە کاتێکدا « لاکێشە » باشترین ووشەیە بۆ ( مستطیل ) . « لاکێشە » لە « لاکێشـ »ەوە دێ کە لە شێوەی (مستطیل ) دایە .

١٣ ـ بۆ ( سائل ) « تراو » دانراوە ( ل ٢٠٢ ) بۆ ( محلول )یش هەر ( تراو ) دانراوە ( ل ٢١٤ ) . ( سائل ) و ( محلول ) یـەك شت نین . بێجگە لەوەش « تراو » ( مائع )ی عەرەبی دەگرێتـەوە کە بریتی‌یە لە ( سائل ) و ( غاز ) .

١٤ ـ بۆ ( کثافة ) « پڕی » دانراوە . ( کثافة ) « پڕی » نی‌یە ،

بەلکو ( چڕی )یە . کورد دەڵێ : « پڕوچڕ » . « پڕ » جیایە لەگەڵ « چڕ » مەبەست لە ( کثافة ) نیزیکی و دووری ووردیلەکانی مادەیە ، واتە « چڕی » ئەو ووردیلانە .

**بەرگی سێیەم/بەشی یەکەم ، ١٩٧٥ ، ل ٥٠٦–٥٤٢**

١ – بۆ ( اجرة مقطوعة ) « ووشکە مز » دانراوە « ووشکە مز » بەوە دەڵێن کە یەکێك کاری بێ بکەن و تەنیا ڕۆژانەکەی بدەنێ ، بەڵام خواردنی نەدەنێ . ئەمە لە کوێ و ( اجرة مقطوعة ) لە کوێ ؟

٢ – بو ( ارتباط ) « پەیوەندی » دانراوە . ڕاستییەکەی « پێوەندی »یە .

٣ – بۆ ( الحاصل ) « دەرامەت » دانراوە . « دەرامەت » کوردی نییە ، لە ( در ) و ( آمد )ی فارسییەوە هاتووە .

٤ – بۆ ( انعدام ) « نەمان » دانراوە . ڕاستییەکەی ( انعدام ) « نەبوونی »یە ، نەك « نەمان » .

**بەرگی سێیەم/بەشی دووەم ، ١٩٧٥ ، ل ٥٢٠–٥٥٢**

١ – بۆ ( مائی ) « ئاوەکی » دانراوە . « ئاوەکی » بەشتێك دەڵێن کە لە نێو شتێکی دیدا توابێتەوە و وون بووبێ . دەڵێن « مەڕەکە ئاوەکی بووە » .

٢ – بۆ ( شراع ) « بایەوان » نووسراوە . وە لە پالییەوە نووسراوە « ماوەیەکە بەکار دێ » . ئەم ووشەیە بۆ یەکەم جار لە « جیرۆکی گەرداوەکە »دا بەکار هێنراوە . بەڵام کۆڕ باسی نەکردووە .

**بەرگی چوارەم ، ١٩٧٦ ، ل ٤٤٢–٤٧٩**

نامەوێ زۆر خۆم بەو زاراوانەوە خەریك بکەم کە لەم بەرگەدا

ئێویان هاتووه، چونکه بە ڕاستی ئەوانەی ئێره ، به تایبەتی زاراوەکانی فەلسەفە ، یەکجار ناشی‌یانه دروست کراون و به جۆرێـــك دڵ دەشێوێنن تەنانەت ئەوانەی زۆر حەز له فەلسەفە دەکـــەن ، فەلسەفەشیان لە بەر چاو دەکەوێ . بەڵام چارم نی‌یه دەبێ چەنـــد نموونەیەك پێشکەش بکەم :

١ ـ بۆ ( نظرية المعرفة ) « دیمانه زانیار » دانراوه . ڕجـــارێ « دیمانه » ( نظرية ) نی‌یه . کورد دەڵێ : « دیمانەت به خێر »واته : دیمەنت به خێر . « دیمەن » ( منظرة )یه . « زانیار » ئەگــــەر لێرەشدا بگونجێ ، ئەوا ( عارف ) دەگرێتەوه نەك ( معرفة ) .

٢ ـ بۆ ( البالغ ) « ڕەسیو » و ( البلوغ ) « ڕەسین » دانراوه ، که هەردووکیان فارسی‌ی ڕوونن و به مانای « بێ گــــەیشتوو » و « بێ‌گەیشتن » دێن . جا ئەگەر ئێمه ووشەیەکی بێگانه به ووشەیەکی بێگانەی دی بگۆڕینەوه ، خۆ هێنسا « بالق »ەکه باشتره که له نێـو کوردەواری دا باوه .

٣ ـ بۆ ( تناسخ الارواح ) « کلێشه گۆڕی » دانراوه . گیـــان ( روح ) لەگەڵ کلێشەی وێنه بەراورد ناکرێ و گیان دەرچوون لـــه لەشێك و چوونه لەشێکی دی‌یەوه وەك کلێشه گۆڕین نی‌یـــــه . کاکەیی‌یەکان که باوەڕیان به (تناسخ الارواح) هەیه وەك ئێزیدی‌یەکان و شەبەکەکان ووشەیەکیان هەیه بۆ ئەمه ، ئەوەشـــی ( دۆنادۆن )ە . « دۆن » به مانای « بەرگ » دێ و « دۆنادۆن »واته « بــــەرگ گۆڕین » . مەبەست لەوەیه که گیانەکه بەرگێك دەگۆڕێ بـــــا بەرگێکی دی .

٤ ـ بۆ ( الجنس ) « ڕەسەن » دانراوه . ئەمه ڕاست نی‌یه . چونکه « ڕەسەن » ( اصيل )ی عەرەبی دەگرێتەوه و ( جنس )یش له هەندێ جێدا « ڕەگەز » دەگرێتەوه .

٥ ـ بۆ ( الحكم ) « سەپاندن » و « سەلمانـــدن » دانراوه . هیچیان ڕاست نـــی‌یه . « ســـــەپاندن » ( فرض کردنـــه ) و

« سەلماندنیش » ( ثابت کردنە )ە .

٦ – بۆ ( خارق العادة ) « سروشت بەدەر » دانراوە . ئەگەر ئەمە ڕاستیش بێ ، دەبێ « لە سروشت بەدەر » بێ . دوایی لە کۆنەوە « سەرئاسا » هەیە بۆ ( خارق العادة ) .

٧ – بۆ ( الزاهد ) « نەویست » و بۆ ( الزهد ) «نەویستی» دانراوە . ( الزاهد ) ئەو کەسەیە کە پشتی کردبێتە دنیا و دنیای نەوێ . لەبەر ئەوە ( الزاهد ) « دنیا نەویست » دەگرێتەوە نەك « نەویست » . هەروەها ( الزهد ) « دنیا نەویستی » دەگرێتەوە .

٨ – بۆ ( السیر فی النوم ) « خەوڕۆیی » دانراوە . ئەم وشەیە لە لای کوردەکانی کوردستانی ژووروو هەیە . بەو کەسەی بە دەم خەوەوە دەڕوا دەڵێن « خەوگەڕ » .



٩ – بۆ ( المعادیة ) « نەیار » دانراوە . « نەیار » وشەیەکی کرمانجیی ژووروە کە بە مانای ( الخصم )ی عەرەبی دێ . (المعادیة) بە زۆری « ڕکەبەرایەتی » و « کینە بە کینە » دەگرێتەوە .

١٠ – بۆ ( المذهب ) « ڕاڕەو » دانراوە . هەتا ئێستە نەم بیستووە بە ( مذهبی شافعی ) بوتری « ڕاڕەوی شافیعی » . « مذهب » بە بیر و باوەڕێکی ئایینی یا سیاسی دەڵێن ، بەلام « ڕاڕەو » گۆڕینێکی وشەیی‌یە وەك ئەوەی « نۆکەر » بە ( تسعة زمال ) بکەیتە عەرەبی . بیست ساڵێك لەمەوبەر بۆ « مذهب »ی ئاین « ئاینزا »م دانابوو ، بە مانای ئەوەی بیرو باوەڕێك یا ڕێگەیەك کە لە ئاینێکەوە هاتبێتە بوون .

١١ – بۆ ( العائم ) « سەراو » و بۆ ( عتلة ) « نوێل » نووسراون . هەردووکیان بۆ یەکەمجار لە « فەرهەنگۆکی فیزیك » و « هەندێك زاراوەی زانستی »دا بەکار هێنراون . بەلام کۆڕ باسی سەرچاوەکەیانی نەکردووە .

١٢ ـ بۆ ( الادراك المعرفی ) « زاناندن » دانراوە . کە شتی وا لە کوردیدا نییە و نەبیستراوە . ( زاناندن ) کە « کاری تێپەڕ » ( فعل متعدی )یە ، ئەوە دەگەیەنێ کە شتێك وا لێ بکەیت بیدەیتە زانین . ( ئیدراکی مەعرفی ) « دانە زانین » نییە . بەڵکو ئەوەیە لە ڕێگەی ( مەعریفەت )ەوە ئیدراکی ڕاستییەك بکەیت .

١٣ ـ بۆ ( الاختیار المبدئی ) « بژاردنی گەڵاڵە » . « گەڵاڵە » خۆی بە شتێك دەڵێن کە پیاو خەریکی بووبێ و ڕێکی خستبێ و بەڵام هێشتا تەواوی نەکردبێ . « بژاردن »یش ( تنقیح )ی عەرەبی دەگرێتەوە . جا ئێستە ئەمە لە کوێ و ( الاختیار المبدئی ) لە کوێ ؟

١٤ ـ بۆ ( التوجیه ) « ڕابەری » دانراوە . وەك لەمەوپێش گوتمان ( ڕابەری ) هەڵەیە و « ڕێبەری » کوردییەکی ڕاستە .

١٥ ـ بۆ ( الاساس ، الارضیة ، الخلفیة ) « پاشخان » دانراوە . لام وایە لە جیاتی « پاشخان » « پشت خان » بوایە چێتر بوو .

١٦ ـ بۆ ( الانتماء ) « هۆگری » دانراوە . ( انتماء ) مانای ( انتساب ) و ( عائدیة ) دەگرێتەوە . بەڵام « هۆگری » مانای ( الفة ) دەگرێتەوە .

١٧ ـ بۆ ( الانماط الاصلیة ) « ڕەسەنەچەشن » دانراوە . کە نە ( اصل ) « ڕەسەن »ە و نە ( نمط )یش « چەشن »ە .

١٨ ـ بۆ ( البداهة ) « هاکو » دانراوە . کە پیاو نازانێ لە چییەوە هاتووە . بیست ساڵێك لەمەوبەر بۆ ( البدیهیة ) « بەڵگە نەویستە »م دانابوو . کە خۆی کاك مەسعوود محەمەد لە هێندێ نووسینی دا بە کاری هێناوە .

١٩ ـ بۆ ( الطمث ) « حەیز » دانراوە . کە ووشەی « بێ نوێژی » لە باتی ئەوە زۆر بەکار دێ .

## تێبینـــــی

ئەم ووتارەم لە تیشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٧دا تـــــــەواو کردووە و هەر لەو مانگەدا ناردوومە بۆ « گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات » ی بەغدا . لە ئێوارەی ڕۆژی شەمەی ٨ی مانگی نیسانـی ١٩٧٨دا و لە کاتی سەردانێکی کورتدا لە لەندەن چاوم بە زانای زمـــانەوان مامۆستا تۆفیق وەهبی کەوت .

لە ئەنجامی ووتووێژماندا و کە هاتینە سەر باســـی « کۆڕی زانیاری » مامۆستا وەهبی گلەییەکی زۆری لـــە کۆڕ کـــرد و هاودەنگیی تەواوی خۆی بەرامبەر بەو ڕەخنانە پیشاندا کە لە کارەکانی کۆڕم گرتووە بە تایبەتی لە نامیلکەی « زمانی یەکگرتووی کوردی »دا.

## پـــەراوێزەکـــان :

١ ـ جەمال نەبەز ، « کورتە مێژوویەکی کوردناسی لـــــــە ئەڵمانیادا » ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، بەشی یەکەم ، بەرگی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٤١٢ـ٤٩٨ . تەماشای ل٤١٢ و ٤١٤ بکە.

٢ ـ کوردەکانی سووریا تەنیا لە پاش شەڕی جیهانی یەکەمەوە تا ١٩٤٥ سەربەستی‌ی نووسینیان بە کوردی هەبوو . کوردەکـــانی ئێرانیش تەنیا لە دەورانی سمکۆ و ماوەی جەنگی جیهانی‌ی دووەمدا. بەڵام کوردەکانی تورکیا ئەوەشیان نەبوو ، ئەگەرچی لە ماوەی ئـەم دەبانزە ساڵەی دواییدا جاروبار زاتیان ناوەتە بەر خۆیان و بـــــە کوردی نووسینیان بڵاو کردووەتەوە .

٣ ـ لە نامیلکەی « زمانی یەکگرتووی کوردی » چاپی بامبێرگ ، ١٩٧٦ ، ل ٧٨ـ٩١دا بە دوور و درێژی باسی مێژووی ڕێنووســـی کوردیم کردووە و ناتەواوی‌ی ئەلفوبێکانم خستووەتە بەر چاو .

٤ ـ بۆ وێنە حاجی قادری کۆیی دەڵێ :

زمانی کوردی بڵاو نەبوو گرد بوو      وا لە مابەینی ئێمە دا تێکچوو

٥ ـ جەمال نەبەز ، زمـانی یەکگرتووی کوردی ، بامبێرگ ( ئەڵمانیا ) ، ١٩٧٦ ، ل٨ .

٦ ـ تەماشای بڕیارەکانی « کۆنگرەی مامۆستایانی کورد لە شەقڵاوە » لە ١١-١٣ی ئەیلوولی ١٩٥٩ بکە لە گۆڤاری « هیوا »دا ، بەغدا ، ساڵی سێیەم ، ژمارە ٢ی کانوونی یەکەمی ١٩٥٩ و ژمارە ٣ی کانوونی دووەمی ١٩٦٠ . هەروەها تەماشای بڕیارەکانی کۆنگرەی دووەمی مامۆستایانی کورد لە ١٥ی ئابی ١٩٦١دا بکە .

٧ ـ تەنیا کارێك کە تا ئێستە لەم مەیدانەدا کرا بێ و لە سەر بنچینەی زانستی زمانەوانی دامەزرا بێ نامیلکەی « زمانی یەکگرتووی کوردی »یە . ئەم نامیلکەیە لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩٧٤دا تەواو بوو ، بەڵام لە بەر هێندێ ، تەفرەدان و دەستی پێکردن ، دوو ساڵ دوا کەوت و دوایی لە ساڵی ١٩٧٦دا ناچار بووم جارێکی دی بینووسمەوە چونکە دەستنووسەکەم ناردبوو بۆ ئاشنایەك تا چاپی بکا بۆم ، بەڵام ئەو ئاشنایە دەستنووسەکەی نەناردەوە بۆم و کەوتە دەست خەڵك . پاش زەحمەتێکی زۆر توانیم تەواوی کتێبەکە تایپ بکەم و لە ئەڵمانیا بە ئۆفسێت لە چاپی بدەم . کۆڕی زانیاریش ئەمە دوو ساڵە ئەو کتێبەی لە بەر دەستدایە و ڕێکەش هەبوو چاپی بکاتەوە ، کەچی چاپی نەکرد . وا دیارە لەبەر ئەوەیە کە لەو کتێبەدا هێندێ ڕەخنە لە کارەکان و هەڵسوکەوتەکانی کۆڕ گیراون .

٨ ـ « سەرەتای میکانیك و خۆماڵەکانی مادە » لە شوباتی ساڵی ١٩٦٠دا درا بە چاپخانەی مەعاریف و لە بەهاری ئەو ساڵەدا لە چاپ دەرچوو . چوار بەرگی دی فیزیك ماون کە هێشتا دەستنووسن و چاپ نەکراون . سەرەتای جەبر تەنیا بە ڕۆنیۆ چەند دانەیەکی کەمی بەسەر قوتابیەکاندا بڵاو کرایەوە .

٩ ـ لە نامیلکەی « نووسینی کوردی بە لاتینی »دا کە لە ساڵی ١٩٥٧دا لە چاپخانەی مەعاریفی بەغدا چاپم کردووە ، باسی ئەم

ئەکادیمی‌یەم کردووە و سەرنجی کوردەکانی ئەویّ بە تایبەتی عوسمان سەبریم بە خەتی خۆی بلاو کردووەتەوە ، تەماشای لاپەڕە هـ ـ ك بکە.

١٠ ـ جەمال نەبەز ، خوێندەواری بە زمانی کوردی ، بەغدا ، چاپخانەی النور ١٩٥٧ ، ل٢٧ـ٣٤ . بێجگە لەوەش لە سالی ١٩٦٠دا و لە گۆڤاری « ڕۆژی نوێ »دا باسی پێویستی‌ی دامەزراندنی کۆڕێکی زمانەوانیم کردووە کە پێك هاتبێ لەوانەی شارەزای زمانی کوردی و زمانی بێگانە و زانستەکانن . بڕوانە ، جەمال نەبەز ، زاراوەکانی لیژنەی ( ریاضیات ) لە ژێر وورد بینی لێکۆلینەوە ، « ڕۆژی نوێ »، ژمارە ، (٦)ی سالی ١٩٦٠ ، ل ١٠٣ .

١١ ـ بە پێی « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » بودجەی کۆڕ لە بودجەی گشتی‌ی دەولەتدا بۆ سالی ١٩٧٦ گەیشتووەتە ٧٠٩٤٠ دینار و بێجگە لەوەش بەخشینی حکومەت هەر لەو سالەدا ٦٩٩٤٠ دینار بووە ، بڕوانە ( ژمارە ٤ی گۆڤار ، ل ٤٨٥ ) .

١٢ ـ د. نەسرین فەخری ، پاشگر و پێشگری ( ڤە ـ یان ـ وە ) لە زمانی کوردی‌دا ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، ١٩٧٣ ، ل ٢٢٤ـ٢٧٣ ، تەماشای ل٢٥٣ بکە .

١٣ ـ هەر ئەوێ ، ل ٢٤٠ و ٢٤١ .

١٤ ـ مەسعوود محەمەد ، بەکار هێنانی (ی) لە ڕێزمانی کوردی‌دا ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٣٩ـ١١٤ .

١٥ ـ مەسعوود محەمەد ، سوورێکی خامە بە دەوری «ڕاناو »دا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، بەرگی دووەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا، ١٩٧٤ ، ل٩ـ١٤٧ .

١٦ ـ شێخ محەمەدی خال ، سەید جەمالوددینی ئەفغانی ،

گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، بەرگی سێیەم ، بەشـــی دووەم ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل١٥٨-٢٠٦ هەروەها بەرگی چوارەم ، بەغـــدا ، ١٩٧٦ ، ل ٨ - ٤٩ .

١٧ - د. پاکیزە ڕەفیق حیلمی ، لە کوێوە دەست بکەین بـــە دەستوورسازی ڕێزمانی کوردی ، گۆڤاری کۆڕ ، بەرگی یەکـــەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ١٨٠-٢١١ و بـــەرگی دووەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٣٢٤-٣٦٢ .

١٨ - د. پاکیزە ڕەفیق حیلمی ، بەزمی ڕێزمان و زمـــانی کوردی ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، بەغدا ، حوزەیرانی ١٩٧٧ ، ژمارە ٦١ ، ل ٥-٩ .

١٩ - وێنەیەك بۆ ئەو قسە زل و پف هەلدراوانە و لـــە بنەڕەتدا نەزانانە و ناشییانە ئەوەیە کۆڕ بە وێنەیەکی لە خۆبایـــی بووانەوە زمانی کوردی زۆر بە دەولەمەند دەداتە قەلەم و هـــەموو بەلگەکەش ئەوەیە کە بۆ یەك واتا زۆر جار ڕێك دەکەوێ چـــەند ووشەیەکی جیاواز هەیە ، بڕوانە ( گۆڤاری کۆڕ ، بەرگی یەکـــەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٤٢٢ ) . ڕاستییەکـــەی دەولەمەندی زمان لەوەدایە کە بۆ هەموو واتایەك ووشەیەکت ببێ ، نەك بۆ واتەیەکی وەك چیا ، ( شاخ و کێو ) و چەند ووشەیەکـــی دیشت ببێ بەلام بۆ هەزاران واتای فیزیك و تەکنیك ووشەیەکت لێ بچێتە قاتی . کە گەل بچڕ بچڕ بوو و ئاخری شەڕ بوو و بوو بـــە چەند تیرە و هۆزێك، دیارە هەر تیرەیەك ووشە و زاری خۆی دەبێ و ئەمەش نیشانەی دەولەمەندیی زمان نییە و لووت بەرزی بێ ناوێ.

٢٠ - یەکێك لەو خراپە کارییانە ئەوە بوو کە کۆڕ لە کـــاتی خۆیدا تکای لێ کردم کە زۆر بە پەلە ووتارێکی بۆ بنووسم لە بارەی ( کوردناسییەوە لە ئەلمانیادا ) . کە بە چەند ڕۆژێك بۆم نووسی و بۆم نارد ، سالێك دوای خست ئەوجا بلاوی کردەوە . کە بلاویشـــی کردەوە هەموو ووشە ئەلمانییەکانی بە هەلە لە چاپدا . لە کاتێکدا کە کۆڕ هی وای تێدایە ، بێ چاوێنی بێ ، ١٠-١٢ سال لە ئەلمانیـــا

خوێندوویەتی . ئەمەش تەنیا لەوەوە نایەت کە کۆڕ بێ دەسەڵاتە ، بەڵکو لە قەدر نەزانینی بەرهەمی ئەوانەوە دێ کە ڕەخنە لە کۆڕ دەگرن .

٢١ ــ د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، لێکسیکۆلۆژی زمانی کوردی ، بەشی دووەم ، بەرگی یەکەم و سێیەم ، ١٩٧٤ــ١٩٧٥ .

٢٢ ــ محەمەد ئەمینی هەورامانی ، تەماشا کردنێکی سەر پێ یی زاری سۆرانی و زاری هەورامی ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، بەرگی دووەم ، بەشی دووەم ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل١١٧ــ١٦٥ ، تەماشای ل ١٢٤ بکە .

٢٣ ــ ئەم باسە بە دوور و درێژی لە نامیلکەی « زمانی یەکگرتووی کوردی » چاپی بامبێرگ ، ل ٨٣ــ٨٤ کراوە .
٢٤ ــ تەماشای گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ژمارە ٦و٧و٨ی ساڵی ١٩٦٠ ، ل ١٠٢ــ١٠٩ ، ل ١١٢ــ١٢١ ، ل ٨٥ــ٩١بکە .

٢٥ ــ ئەم « دێری »یە لە کۆنەوە لە زمانی کوردیدا بەکار دەهێنرێ ، بە تایبەتی لە زاری فەیلی و شێوەی لوڕیدا . بۆ وێنە بابا تاهیری هەمەدانی دەڵێ :

دڵێ دێرم ز عەشقت گێج و وێجە
مژە بەرهەم زەنەم خۆنا بڕێجە
« مێژووی ئەدەبی کوردی ، ل ١٤٨»

٢٦ ــ ووشەی « جماعة » لە شێوەی کرمانجیی نێوەڕاست ( سۆرانی و موکری و سنەیی ... هتد )دا بووە بە « جەمات » واتا نەبووە بە کوردییەکی تەواو کە دەبوو ( جەوات ) یا ( جوات )بێ . بەڵام لە کرمانجیی ژووروودا شێوەی ڕاستەقینەی خۆی کە « جڤات »ە وەرگرتووە .

٢٧ ــ دەنگی ( غ ) کە پێش تیپێکی دەنگدار بێ لە نێوێك یا

ئاوەڵنێوێکی زمانی فارسی‌دا ، بە زۆری ئەو دەنگی ( غ )یە لـــە کوردی‌دا وێنەی دەنگی ( خ ) وەردەگرێ . بۆ نموونە : داغ ، زغال ، غلتان ، غونچە ، باغ ، رغنە ... هتد ، لە کوردی‌دا بە وێنـــەی : داخ ، زووخاڵ ، خەلتان ( بۆ خوێن ) ، خونچە ، باخ ، ڕەخنـــە ، دەردێن . بێجگە لەوەش ئەگەر ووشەیەکی عەرەبی یا تورکی هاتبێتە کوردی‌یەوە و ( غ )ی تێدا بوو بێ ، ئەو ( غ )ە بـووە بە ( خ ) . بۆ وێنە : غافل ، غلط ، غم ، غلیظ ، غرامة ، غش ، غفور ، غلـــة ، غیرة ، غنی ، غلام ، غرار ، بوون بە : خافل ، خەڵەت ، خـەم ، خەلیس ، خەرامان ، خەوش ، خەفوور ، خـــەلە ، خیرەت ، خولام ، خەراز . هەروها ووشەی تورکی : ساغ ، چاغ ، ئۆجاغ ، یاغی ، بوون بە : ساخ ، چاخ ، وەجاخ ، یاخی . لـەبەر ئــەوە ، ئەو ووشانە لەم بابەتەن پێویستە بە شێوەی ڕاستی خۆیـــــان بنووسرێن ، واتە بە (خ) نەك (غ) . هەروەها « بناغە » کـــە لـــە بنەڕەتدا لە «بن» و « ئاخ » ( = گل )ەوە هاتووە نابێ بە « بناغە » بنووسرێ ، بەڵکو بە « بناخە » .

٢٨ ــ سەرنجی (م)ی فارسی و (و)ی کوردی بدە لە ل٩١و٩٢ی ئـــەم ووتارەدا .

٢٩ ــ جەمال نەبەز ، سەرەتای میکانیك و خۆماڵەکانی مـادە ، بەغدا ، ١٩٦٠ ، ل٢٦ .

٣٠ ــ جەمال نەبەز ، هەندێك زاراوەی زانستی ، سلەیمانـی : ١٩٦٠ ، ل١٦ .

٣١ ــ جەمال نەبەز ، سەرەتای میکانیك ... ، ل ١٩ .

٣٢ ــ زمانی کوردی بە پێچەوانەی زمانی فارسی‌ی تازەوە دەنگی ( ژ )ی کۆنی پاراستووە . لـــەوانەیە ( ژ ) لە ( چ ) یا ( ج )ی ئاڤێستایی‌یەوە هاتبێ و لە کوردی‌دا ــ وەك فارسی‌ی نێوەڕاســـت ( پەهلەوی ) بووبێ بە ( ژ ) و لە فارسی‌ی تازەشدا ( ز )ــە . ئەم ( چ )ی ئاڤێستایی‌یە ئێستەش لە هێندی ووشەی کوردی‌دا بـە ...

ته‌واوی وه‌ك خۆی پارێزراوه . بۆ وێنه سه‌رنجی ووشــــــه‌ی ( به‌رۆچکه )ی کوردی بده‌ن و له‌گه‌ڵ ووشه‌ی ( راۆچـــــــاه (raocah )ی ئاڤێستایی که مانای ( ڕۆژ )ه به‌راورد بکــه‌ن . هه‌روه‌ها سه‌رنجی ووشه‌ی ( ڕۆچیار ) که ناوی فریشته‌یه‌کــــی گه‌وره‌یه لای کاکه‌یی‌یه‌کان و دیاره به مانای ( ڕۆژیار ) دێ بـــده‌ن . به‌م جۆره ووشه‌ی فارسی : زن ، زنگ ، زانو ، روز ، زیـــر ، زدن ، زیستن ، از ، تیز ، کوردی‌یه‌کانیان ئه‌مـــانـــه‌ن : ژن ، ژه‌نگ ، ئه‌ژنۆ ( ژنۆ ) ، ڕۆژ ، ژێر ، ژه‌ندن ، ژین ، ژ ( واتـــه « له » به کرمانجی‌ی ژووروو و به ئاڤێستایی « هـــه‌چه » ) ، تیـژ ( تێژ ) . له‌به‌ر ئه‌وه ووشـــــه‌ی دلسۆز ، زیره‌ك ، بازاڕ ، زرنـگ کوردی‌یه ڕاسته‌قینه‌کانیان که له شێوه‌ی کرمـــانجی‌ی ژووروودا ماون ، ئه‌مانه‌ن : دلسۆژ ، ژیره‌ك ، بازێڕ ، ژره‌نگ . هـــه‌روه‌ها ووشه‌ی زه‌هر ، دۆزه‌خ ، چه‌ند کوردی ڕاست نین ، به‌ڵکو ژه‌هـــر ( ژار ) ، دۆژه ( کرمانجی‌ی ژووروو ) ، هه‌ژ ( کرمـــــانجی‌ی ژووروو ) ڕاستن . هه‌ر له به‌ر ئه‌وه‌ش « بازێڕ » کوردی ڕاستـــه نه‌ك « بازاڕ » .

٦ ,

ئه‌مجا ده‌مێنێته‌وه سه‌ر ده‌نگی (a) له ووشه‌ی بـــازاڕ دا و ده‌نگـــــــی (ê) لـــه ووشه‌ی بازێڕدا « واتا : ئا و ئێ » . بـــه پێ‌ی ده‌ستووری زمانه‌وانی به زۆری له ووشه‌ی فارسی‌ی تـــازه‌دا تیپی ده‌نگداری درێژ (a) که پاش تیپێکی بێ ده‌نگ بێ ، ئـــه‌و تیپه ده‌نگداره درێژه له هه‌مان ووشه‌ی زمانــی کوردی‌دا ، شێوه‌ی تیپـــی ده‌نگـــــداری خوار ( الامالـــــة Deflection واتـــــــه ( ێ ê وه‌رده‌گرێ . بۆ وێنه ووشه‌ی فارســـــی : زاب ، راه ، جا ، پا ، ماده ، شام ، ستاره ، کارد ، همسایـه ، دراز ، چاشت ، کرایه ، دوات ، له کوردی‌دا به‌م جۆره‌ی خواره‌وه دێنـــه ده‌رێ : زێ ، ڕێ ، جێ ، پـــــێ ، مێ ، شێو ، ستێـــــر ( ئه‌ستێره ) ، کێرد ، هـــــاوسێ ، درێژ ، چێشت ( ێشت ) ، کرێ ، دوێت ، جا ئه‌م ده‌ستووره فۆنۆلۆژی‌یه‌ی زمـــــانی کوردی ته‌نیا ڕاست ده‌رناچێ ئه‌گه‌ر بێتو کوردی له‌گه‌ڵ فارسی‌دا بـــه‌راورد بکرێت ، به‌ڵکو ته‌نانه‌ت هێندێ جار ئه‌گه‌ر ووشه‌یه‌کی عه‌ره‌بیش بێته زمانی کوردی‌یه‌وه هه‌ر به‌و جۆره‌ی لێ دێ . بۆ وێنه : کتاب ، الفباء ،

حساب ، دەبنە کتێب ئەلفوبێ ، حسێب . هەروەها « جاریة » و « زیادة » لە هێندێ زاراودا دەبنە « جێری » و « زێدە » . هەر لە بەر ئەمەیە « ڕێبەر » لە « ڕابەر » و « لەرز و تێ » لە « لەرز و تا » و « گرانەتێ » لە « گرانەتا » و « نێو » لە « ناو/ڤ » ڕاستترن . بەم پێیە « پێتەخت » ( کە لە موکریانی بەکار دێ ) لە « پایتەخت » و « بازێڕ » لە « بازاڕ » ڕاستترن . هەروەها « چێتر » لە « چاتر/چاکتر » ووشەی « خودێ » لە « خودا » ڕاستترن .

٣٢ـ سەرنجی (م)ی فارسی و (و)ی کوردی بدە لە ل٩١و٩٢ی ئەم ووتارەدا .